# ڕۆشنبیری نوێ



ژمارە ٧٢-٥
شوباتی ١٩٧٩



بەبۆنەی ساڵی جیهانیی منداڵان

## لەم ژمارەیەدا



**براینە ، دۆستینە ..**

جوانترین سلاوتان لێ‌دەکەم لە بەغدای عەرەبایەتیو شۆڕشو پێشکەوتندا خۆش‌هاتنتان لێ‌دەکەم هیوادارم کۆبوونەوە کەتان ئەوپەڕی سەرکەوتن وەدەست بێنێ لەپێناوی وەدی‌هێنانی ئامانجەکانیدا بەرەو چەسپاندنی هاوکاریو قایم‌کردنی پەیوەندیەکانی نێوان رۆژنامەنووسانی ولاتەبێ‌لایەنەکان .

ئەم کۆبوونەوە گرنگەتان کە بەرهەمی بڕیاری کۆبوونەوەی دووەمی ئەنجومەنی کاررێکخستنی حکومەتیە بۆ کاروباری راگەیاندن ، لەداڕشتنی پایەی سیستەمی نوێی راگەیاندنی جیهانیدا بەشداری‌یەکی بەرچاوە ، هەروەها یاریدەدەری راستکردنەوەی‌ئەو نارێکیەی ئێستایە لە هەڵقولانی هەوالدا بەشێوەیەکی‌هاوکێش لە نێوان دەولەتانو گەلانداو دەبێتە مایەی بەدی‌هێنانی ئاڵوگۆڕکردنی زیاتری زانیاریو کەرەستەی راگەیاندن کە ئاوێنەی ئەو گۆرانکاریە سیاسی کۆمەلاتیو ئابووریو رۆشنبیریانەیە کە رەوتی‌دەولەتانی ولاتە بێ‌لایەنەکان پاش وەدەست هێنانی سەربەخۆیی نیشتیمانیو بەقوربانی‌دانی گەورە ، چەسپاندیان .

**سەرۆکی فەرماندە**
**خەباتگێڕ احمد حسن بکر**


# ڕۆشنبیری نوێ

دەرهێنانی هونەری : ــ شوکر جاسم

بلاوکراوەیەکی ئەدەبی ڕۆشنبیرییە دەزگای ڕۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

ناونیشان : دار الثقافة والنشر الكردية ـ ساحة الخلاني ـ بغداد

تەلەفۆن : ٨٨٧٥٧٩٥ پێنج خەت

سەرپەرشتکاری گشتی
سعاد أديب علي

نرخی ٥٠ فلسە

ئەم ژمارەیە ٨٠٠٠ دانەی لێ چاپکراوە



# له پەیامێك دا كە سەرۆكی فەرماندە كاك احمد حسن البكر ئاراستەی منداڵانی جیهانی كردووە :

# شۆڕشی منداڵ بە سامانێكی نەتەوەیی دادەنێ

بەڕێز سەرۆك احمد حسن البكر دووپاتی‌كردەوە كە منداڵی عێراقی ، لە ماوەی دە ساڵی ڕابوردووی تەمەنی شۆڕشی حەڤدەی تەمووزدا ، بایەخێكی فراوانی پێ‌دراوە .

سەرۆكی بەڕێز لە پەیامێك‌دا كە ئاراستەی منداڵانی جیهانی كرد بەبۆنەی دانانی ساڵی (١٩٧٩)ەوە بەساڵی جیهانی‌ی منداڵان ، ووتی : نەخشەكانی ئابووری‌و كۆمەڵایەتی بە چەند پرۆگرامێكی گرنك پشت گیری‌یان لێ‌كراوە لەپێناوی پەرەپێدانی منداڵو چاودێری‌كردنی‌و بە شێوەیەكی باشی داهێنەرانە ئاراستەكردنی .

مەش دەقی پەیامەكەی سەرۆكی بەڕێزە :

بڕیاردانی كۆمەڵەی گشتی لە خولی سی‌و یەكی‌دا بەدانانی ساڵی ١٩٧٩ بە ساڵێكی جیهانی‌ی منداڵان‌و ئەو بڕیارەی كە لیژنەی دووەمی سەر بە نەتەوە یەكگرتووەكان لەڕۆژی ١٧ـ١١ـ١٩٧٨ دا خستیە ئەستۆی خۆیەوە بەدانانی ساڵی ناوبراو بەساڵی جیهانی‌ی منداڵان ، لەووڵاتی ئێمەدا پێشوازی‌كردنێكی فراوان‌و خۆئامادەكردنێكی گرنگی بۆ سازكرا چونكە لە ووڵاتەكەمان‌دا شۆڕش منداڵ بە سامانێكی نەتەوەیی دادەنێت كە شایانی چاودێری‌كردنێكی تەواو بێت .

ئەوەبوو منداڵ لە ووڵاتەكەماندا بایەخێكی فراوانی پێ‌درا لە ماودی دە ساڵی ڕابوردووی تەمەنی شۆڕشی حەڤدەی تەمووزی ١٩٦٨داو نەخشەكانی پەرەپێدانی ئابووری‌و كۆمەڵایەتی بە چەند پرۆگرامێكی گرنك پشت‌گیری‌یان لێ‌كراوە لە پێناوی پەرەپێدانی منداڵو چاودێری‌كردنی‌و بەشێوەیەكی باشی داهێنەرانە ئاراستەكردنی .

پەروەردەكردنی ساوایان‌و بنیاتنانی كۆمەڵگای نوێ‌و بەربەرەڵا كردنی ووزە داهێنەرەكانی مرۆڤی عەرەب پرۆگرامەكانی ئێمەن بەرەو سەربەستی‌و بنیاتنان ، چونكە ناتوانرێت گۆڕانكاری‌ی بنەڕەتی‌و فراوان لە كۆمەڵگای عەرەب‌دا بهێنرێتە گۆڕێ بەرەو وەدی‌هێنانی ئامانجەكانمان ئەگەر ئەم چەشنە چاودێری‌كردنە نەگرێتەخۆی .

لەكۆتایی‌دا ڕێز لەم بڕیارە ددنێم كە ساڵی (١٩٧٩)ی بەساڵی جیهانی‌ی منداڵان داناو كۆمەڵەی گشتی‌ی سەر بە نەتەوە یەكگرتووەكان خستیە ئەستۆی خۆیەوە .. لەگەڵ ڕێزگرتن‌دا .

# هاوڕێ صدام حسین لە وتەیەکیدا بۆ دەستەیەکی پێشڕەو لە داهێنکاری ڕووت نامانگەیەنێتە بیروباوەڕ .. بیروباوەڕیش

**لە ئێوارەی (٥) شەممەی ٢٨-١٢-١٩٧٨ بەو بۆنەیەوە کە دەستەیەك لە پێشڕەوانی حزب لەناو ڕێکخراوی سەربازیدا سوێندی وەرگرتنی شەرەفی ئەندامیەتیان دەخوارد لە هۆڵی (الخلد)دا ، هاوڕێ صدام حسین جێگری ئەمینداری نهێنی سەرکردایەتی قوتری حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دوانێکیدا کە ئەمە دەقەکەیەتی :**

**هاوڕێ خۆشەویستەکان ، پێش ئەوەی چەند وشەیەك لەم ڕێکەوتەدا بڵێین ڕەخسەت لە هاوڕێ عزة وەرئەگرم کە دەقیقەیەك بە خامۆشی بۆ گیانی سەرکردەیەکی بەناوبانگو تێکۆشەرێکی عەرەب بوەستین کە سەرۆك بومدینە .**

هاوڕێ عزة ابراهیمی تێکۆشەر شتێکی ئەوەندە زۆری بۆ نەهێشتمەوە کە لەم ڕێکەوتەدا بیڵێم و لە سەرەتاوە دووپاتی دەکەمەوە دوای پیرۆزبایی لێکردنتان بەم شەرەفە گەورەیە کە بە بەرگری کردن لە شەرەفی بیروباوەڕ وەرتان گرتووە و بە شەرەفی ئەندامیەتی ڕازانتانەوە . ئەڵێم و گرنگی کارڕێکخستنی وردو لێهەڵێنجانێکی وردی ئەو ئامۆژگاری یانە دووپات دەکەمەوە کە هاوڕێ عزة پێی ڕاگەیاندن و لە پێشیانەوە وەرگرتنی دەرسی کاریگەرو زیندوو لە مێژووی عەرەب و لەپێشیەوە لە مێژووی عەرەبی ئیسلامی لە بەر ئەوەی کە دەرسی کاریگەری ئەوتۆیان تێدایە کە توانای ئەوەشی دەمێنێ بەشێوازە گەشە سەندووەکەی بە زیندوویی بمێنێتەوە ، نەك بەشێوازی گوێزراوە بۆ نەوەو نەوەکانی داهاتوو . هەروەها توانای ئەوەشی دەمێنێ کە دەرس و بیروباوەڕمان پێ ببەخشێ و بشتوانێ ژیان بنیات بنێ هەروەکو باووباپیران پێشتر کردویانە . دووبارە ئەمە نەك بەشێوازی ئارەزوو کە ژیانێکی لەیەکچوو بەشێوازی وەرگرتن بنیات بنێین ، بەڵکوو بەوەی کە لەگیانی بیناکردنی ئەوژیانەو یاساکانی بەشێوازی بیر کردنەوە لە دنیاو لە ژیان و لە بە توانابوونی ئیرادە لە بەرەوپێشەوە بردنیدا لە پێناو ژیان و بیناکردنی یاساکانیدا ئیلهام وەربگرین .

گرنگترین دەرس کە بەڵگەی پێ دێنمەوە ، دەربارەی جەنگێکی بنچینەیی یە کە لە سەرەتای ئیسلامدا ڕوویدا ، سەبارەت بە موناقەشەیەك لە نێوان پێغەمبەری مەزن و یەکێك لە سەربازەکانی پێغەمبەردا ، کە لە هەمان کاتدا هاوڕێشی بوو . بە گیانی سەربازو هاوڕێ موناقەشەی دەکرد نەك بە گیانی سەرباز . پێویستە ئەوە بڵێین کە لەوانەیە هێندێکتان وا دەبیستێ و دەبینێ و هەست دەکا کە تائێستا کەم و کورتی یەك لە گیانی مامڵەت کردن لە نێوان ئەفسەری بچووك و ئەفسەری پلە بەرزتر لە خۆیدا هەیە . زۆر لە ئێوە کە دەبێتە سەربازی یەك خەتو بەرەوژوور ئەوە لە بیر دەکا کە ڕۆژی لەڕۆژان سەرباز بووەو کە چۆن ڕەخنەی لە گیانی ڕەفتارو مامڵەکردنی نێوان خۆی و ئەفسەری ڕیزگرتوە .

ئەفسەریش کە دەگاتە پلەیەکی بەرزترو شوێنێکی بەرزتر ، ئەوەی لە بیر دەچێتەوە کە چۆن پێشتر گیانی مامڵەکردنی نێوان خۆی و ئەفسەرێکی شوێن و پلەبەرزتر لە خۆی ڕەخنەی لێ دەگرت :

لە بۆنەیەك لە بۆنەکاندا لە سەردانێ بۆ هەندێ لەو بەشانەی کە لە باشوورن ، هاوڕێ وەزیری بەرگریمان لەگەڵ بوو ، لەو سەردانەدا بە ئەفسەرەکانم وت : گیانی مامەڵەکردنی ناو سەنگەرەکانی شەڕ لە نێوان سەربازو ئەفسەری ڕیزدا ، لە دۆخی ئاشتیدا بۆناو مەیدانەکانی مەشقلێکردنی بگوێزنەوە . نەموت ئەو شێوازی مامەڵە کردنەی نێوانتان و نێوان سەربازو ئەفسەری ڕیز بگوێزنەوە بۆ مەیدانی مەشق لە دۆخی ئاشتیدا کە لە ناوسەنگەرەکانی شەڕو ڕەبایەکانی بەرزایی شاخەکان ڕەفتارتان کردوە . بەڵکوو وتم گیانی ئەو مامەڵەیە بگوێزنەوە ، چونکە جیاوازی لە نێوان شێوازی مامەڵەو گیانی مامەڵەدا هەیە . لام ڕوون بوو کە لە تواناداا نی یە شێوازی مامەڵەکردنی دۆخی جەنگ دەقاو دەق بگیرێتە بەرو لەدۆخی ئاشتیدا بە

## تێکۆشەرانی ڕێکخراوی سەربازی حزب :

# بەبێ ئیرادە بەدی نایەت



مامەڵەیەکی ڕاست بژمێررێ لە نێوان فەرماندەو بەردەستەکەیدا یاخود سەرکردەدا ، بەڵکوو مەبەسم ئەو گیانە مرۆڤایەتی‌یە خۆشەویستە گەشەبوو کە وا لە ئەفسەر دەکا لەگەڵ سەربازدا نان بخوا ، گیان ، ئەوەم پێ‌مەبەست نی‌یە کە ئەفسەر لە دۆخی ئاشتیدا لەگەڵ سەربازدا بخوا ، بەڵکوو گیانی ئەو ڕەفتارەم پێ مەبەستە کە وای لێ‌دەکا برام‌و کوڕم بەسەرباز بڵێ‌و لەدۆخی شەڕدا برایانە بێ چونکە ئەمە زۆر پێویستە ، هەمان گیانیش مامەڵەکردنی مرۆڤایەتیش لە دۆخی ئاشتیدا دەبێ ، بەڵام بەشێوازەکانی تر .

ئەقڵی مرۆڤ بێ‌تو نا نی‌یە لەوەدی کە ئەو شێوازانە هەڵبێنجێ کە دەتوانێ مرۆڤایەتی‌یەکەی بۆ بپارێزێ‌و لە هەمان کاتدا یاساکانی دابینکاریش بە ئەوپەڕی ڕادە بهێلرێتەوە بۆ وەدیهێنانی ئەو ئامانجە گەورانەی کە لەپێناویاندا لە ناو هێزە چەکدارەکاندا تێدەکۆشن ، هەروەکو چۆن برایانتان لە کارگەو کێڵگەو قوتابخانەو مەیانەکانی تردا تێدەکۆشن . جاران ، گیان لەنێوان سەربازی هاوڕێ‌و لە نێوان سەرکردەدا لە گیانی ئەو عەرەبانەی کەلەو گیانەوەو سەرباری ڕێ‌وشوێنەکانی ئاسمان ، وەك بڕوایەك کە تەکان‌یدا بۆ ڕسکاندنی ئیرادەیەکی بەتوانا داری بەردوپێشەوە چوون . گەیشتنە ئەو ناوچانەی کە بە درێژایی‌و پانایی زەوی دەیانزانن ئاوا بووو دابینکاری عەرەبیش کەم ئەبووو دابینکاری‌یەکی ، وا کە لەدەمی شیر تیژ تر بوو لەوەی کە دەستبدرێتە هێنانەدی ناخۆشترین جەنگ . هەمووتان مێژووی عەرەب دەزانن‌و لەسەرتانە زیاتر ئەم مێژووە بخوێننەوەو هەمووشمان لە سەرمانە زیاتری بخوێنینەوەو سەبارەت بە لێکۆڵینەوەو لێهەلێنجانی دەرسەکاریگەرەکان کەهو کورتیمان لەمانا تێگەیشتن لەناوێنەی مێژوودا پێوە دیارە . پێش ئەوەی لەم هۆڵەدا بگەینە لاتان ، وام بەبیرداهات کە ژمارەتان بزانم ، ئەو ژمارەیەی کە ئیمڕۆ شەرەفی ئەندامیەتی وەردەگرێ ، بەو ژمارەیەوە کە ئیمڕۆ لە لقی ژوروو شەرەفی ئەندامیەتی‌یان وەرگرت ، کۆمەڵێ پێشکەش بە حزبەکەتان دەکەن کە لەم دەستەیەو دەستەی لقی ژووروودا شەرەفی ئەندامەتی‌یان وەرگرتوە ، لە ژمارەی ئەو تێکۆشەرانە نزیك دەبێتەوە کە تا شەوی ١٦/١٧و تاوەکو بەیانی ١٧ تەمووزیش لەریزی حزبتاندا بوون .

حزبتان تەنیا بە حەفتا هاوڕێ لە نێوان هلوڕێ ئەفسەرو مەدەنی ئەفسەری بەعسی چووە ناو کۆشکی کۆماری‌یەوەو مرۆڤ دەپرسێ کە چۆن ئەمە بەحەفتا کەس دەکرێ . بێگومان هەروەها هلوڕێ‌یانی تریش هەبوون کە لەیەکێك لە وەکرەکانی‌کەدا کاریان پێ سپێرابوو ئەو بەختەیان نەبوو کە لە بەشەکانی تردا بن .. هاوڕێ‌یانی تریش لە لیوای زرێپۆشی دەیەمدا هەبوون‌و هەروەها هاوڕێ‌یانی تریش هەبوون کە لە شوێنەکانی خۆیاندا ئامادەبوونو هەروەها هاوڕێ‌یانی تری مەدەنیش هەبوون کە لە ناوچە هەستدارەکاندا کۆبوبوونەوە . بەڵام ژمارەیان هەرچەندێ بووبێ ، لە ژمارەی هەردوو بەشی هاوڕێ‌یانی ئەم جارەو جارەکەی لقی ژوروو کە دووڕۆژ لەمەوبەر سوێندیان خوارد تێناپەڕێ .

هەر ڕێك‌دەکەوێ کە مرۆڤ ئەوە بپرسێ کە چۆن ئەم کەمایەتی‌یە شەرعی‌یە دەستووری‌یەی

سوپایەکی رەسمی هەیەتی ، سەرکەوت !! ئەوان لە دامەزراندنی سوپایەکی رێکوپێکدا بەتەنگ فەرمانە تەقلیدیو پەروەردە یەکانەوە بوون .. چۆن ئەم کەمایەتی‌یە کەمە دەتوانێ لەرێگای ناشەرعیەتی دەستووری‌یەوە ، ئەو شەرعیەتە دەستووری‌یە ببەزێنێ کە توانایەکی بەرفراو نی لە جیهازو بەدالەی تەلەفۆنیو ئۆتۆمۆبێلو فڕۆکەو توانای دارایی‌و تادوایی لەشتی تردا هەیە !! !

ئەوە لەبەر ئەوەیە کەلە هاوڕێکانتانداو لە حزبتاندا بۆ بەجێهێنانی کاری شۆڕشگێرانە لە بنیاتنانی کۆمەڵگای نرێدا ، بۆ بەرزترین رادەی شەرعیەتی بیروباوەڕ بەرزبۆتەوە ، تاوەکو بەسەر ئەو شەرعیەتە دەستووری‌یەدا سەرکەوێ کە تا ئەوپەڕی رادەی دوورکەوتنەوە لە شەرعیەتی بیزوباوەڕانە لای داوە .

لەبەرئەود ، ئەی هاوڕێیانی ناو هێزە چەکدارەکان ، ئێستا لە بەهێزکردنی کار رێکو پێکیدا ، چەکێکتان لەناو سوپادا بەدەستەوەیە کە زۆر لە سوپاکانی جیهانی سێیەم نیانەو ئەویش چەکی‌باوەڕبوونە بە بەهانویکانو بەبیروباوەڕەکان .. و هەستکردنی سەربازو ئەفسەرە بەوەی کە بالاترین پابەندبوون ، رێبازی هێنانەدی بیروباوەڕە . کە چی زۆربەی سوپاکانی جیهانی سێیەم لە پابەندبوونداا ، تەنها بە تێڕوانینێکی تاکی‌ی بیروباوەڕ کار دەکەن ، چونکە زوربەی ئەو سوپایانە پەروەردەی سەربازی‌یان لێ هەڵبراوەو ئاواتی گشتی شەخسیش لەگەڵ ئاواتی رژێمەکانی‌و پەروەردەی رژێمەکانی‌و ئەقلیەتی رژێمەکانی بەیەکەوە نەلکاوە . ئێستا رێکوپێکی لەلاتان لەگەڵ ئەرکەنیشتمانی‌و نەتەوەیی‌یەکان بەیەك دەگەن . ئەمەیە ئەو چەکە گەورەیەی کە ئەگەر بەباشی بەکارتان‌هێنا ، دەتوانن سەربازێکی نەبەز جاچ ئەفسەر بێ یاخود سەرباز یاخود ئەفسەری ریز . دروست بکەن کە بتوانێ بەرادەی رێکوپێکی‌یەکە بەرزبێتەوە هەروەك دەشتوانێ بەرادەی تێگەیشتنی بیرو باوەڕو بڕوابوون پێی تا رادەیەکی وا بەرزبێتەوە کە گیانی ئەو سەردەمانە بنوێنێ کە هاوڕێ عزة ابراهیم لە مێژووی تێکۆشانی باپیرانتاندا ، بەر لەمە ، پەنجەی بۆ راکێشا .

رێکوپێکی بەبێ بیروباوەڕ ناتوانێ گەیشتن بە بیرو باوەڕ بەدی بهێنێ ، بیرو باوەڕیش بێ ئیرادە ناتوانێ لە کارکردنا بەرەوپێشەوە بچێ . ئەگەر بتوانرێ وای بۆبچین کە شۆڕشی تەمووزی ١٩٦٨ بەرپا نەبوایە ، ئێستا لە تواناداا نەدەبوو دۆخی حزب بەم چەشنەبێ ! ئایا دۆخی ئێستای عیراق چۆن دەبوو ! هەروەها ئاخۆ دۆخی عەرەب چۆن دەبوو لەبەر ئەوە ناتوانرێ بۆچوونێکی‌راست لە رێبازی گەیشتن بە ئامانجەکاند بێ ، بەڵکوو ئیرادەی پتەوو چالاكو ئامادەبوونی بەیەك بەستراوەوە لە گەڵ بۆچوونی راستدا لە ساتی لەباردا ، مەسەلەیەکی زیندووی‌ترە . لەبەر ئەوە هەرچەندە ئێمە ئامانەوێ خۆمانی تێوەردەین‌و خۆمان بکەین بە لێکدەرەوەی نایین ، بەڵام حەقی خۆمانە کە لێکدەرەوەی مێژووبین .. ئەمەش لەبەر هۆی بەکاری ناو مێژووەکەمانە ..

شتێکی رێکەوت نەبووە کە هەموو ئاینە ئاسمانی‌یەکان‌لەم خاکەدا هاتبنە خوارو گەیاندنی گیانی ئاینە یەك بەدوای یەکەکان کە وتبێتە ئەستۆی گەلی ئەم خاکە ، خاکی عەرەبی ، ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی کە بە پێی لێکدانەوە تەقلیدی‌یەکان گیان‌و ئەقلی نەتەوەی ئەم شوێنەی لەسەر انطباع دەکرێ یاخود بێ طبع‌دەکرێ . لەم شوێنەدا توانای افتراض‌کردنی مامەڵەکردنی ماددە بۆ مامەڵەکردنی گیان هەیە . نەك هەر ئەمەو نەك هەر ئەو سیفەتەش وای کردوە کە بێ لە هەموو جیهان ، گەلی ئەم خاکە هەلبژێررێ بۆ ئەوەی پەیامەکانی ئاسمان بەنیابەت لە ئەستۆبگرێ ، واتە پەیامەکانی ئاسمان کە بۆ گەلانی هەموو جیهان‌و تێکڕای مرۆڤایەتی نێرراوە بەجێ‌بهێنن . ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە گیان‌و ئەقلیان دەتوانێ بەرگە بگرێ یاخود مانای پەیوەندیی بە گیانو مامەڵەکردن لەگەڵ ئاسماندا هەڵسەنگێنێ‌و خۆ نقوم‌کردن بە تەنها لە یاساکانی زەویدا بەجێ بێڵێ ... واتە سەرەڕای ئەمەش وە بە رادەی گرنگی‌ی ئەم هۆیە بەڵکو لەوانەیە لە هەندێ لایەنەوە پەسندیشی بکەین‌لەبەر ئەوەیە کە ئەم گەلە توانای قوربانی‌دانی هەیەو دەتوانێ ئیرادە بەرادەیەك بەکاربێنێ کەوای لێ‌بکا توانای بەسەر گواستنەوەی بەهاکانی‌ئاسماندا بشکێ بۆفراوانترین‌و دوورترین پارچەی سەر زەمین . عەرەب‌و ئیرادەی عەرەب بەم چەشنە بووە کاتێ رێ‌و شوێنەکانی ئاسمانیان بە قەناعەت پێکردن‌و هۆکانی ترەوە گەیاندۆتە دوورترین

کووچەی سەرزەمین . کەواتە بوونی ئیرادە مەسەلەیەکی بنچینەیی یە . راستە هیچ ئیرادەیەك بێ بڕوا نابێت وەك پێویست بەڵام هیچ ئامانجێك یاخود گەیشتن بە ئامانجێکیش وەك پێویست ناڵوێ کە وەك پێویستئیرادەی لەگەڵدا نەبێ . لەبەر ئەوە ئێستا ئەوەمان لێ داوا ناکرێ کە تەنها وەك پێویستە لە عەقیدەکەمان بگەین بەڵکو ئەوەمان لەسەرە کە وەك پێویست گەشە بە ئیرادەمان بدەینو وەك پێویست بەکاری بهێنین بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەی کە عەقیدەو پەیامە مرۆڤایەتیو نەتەوەییەکەمان لەم قۆناغەو قوناغەکانی داهاتوودا لەسەر ئەم بنچینەیە دەیکێشێ .

ئەی هاوڕێیان هەریەکێك لە ئێوە نەك هەر سەرکردەیەکە لە سوپای عێراقدا بەڵکو سەرکردەیەکی گەلی عێراقو سەرکردەیەکیشە لە نەتەوەی عەرەبدا بەحوکمی ڕێو شوێنو یاساکانی ئەو پەیامەی لە ئەستۆتان گرتوە بەلاتانەوە ئاشکرایە کە دەبێ ئەو کەسەی لەناو نەتەوەی عەرەبدا دەبێتە سەرکردە ، پێویستە بەهەموو سیفەتەکانی ئەم سەرکردەیە رەفتاربکا کە لە پێشی هەموویانەوە ، لەسەر خۆیی بۆ بەهێزکردنی شەخسیەتو مەبدەئیەتە بۆ بەهێزکردنی کار .

ئەگەر رۆژی لە رۆژان لێتان تێکچوو کە کامیان دەکرێو کامیان راستترە، ئاخۆ شێوازی دەوڵەت بۆ وەدیهێنانی بیرو باوەڕەکان یاخود شێوازەکانی حزب بۆ وەدیهێنانی بیرو باوەڕەکان بەکار بهێنرێ ؟ ئەگەر نەتتوانی بە روونی ئەمە هەڵبژێری ، لەسەرتە شێوازەکانی حزب هەڵبژێری ، چونکە هەڵەی تێدا لە هەڵەی شێوازەکانی دەوڵەت کەمترە کە هەڵی دەبژێری .

هەڵە هەیە کە دەبێتە هەڵەیەکی ستراتیجیو هەڵەش هەیە کە ناگاتە ئەمرادەیە ، بەڵام هەڵوێستی راست ئەوەیە کە هەمیشە بە روونی بزانی لە کوێ شێوازەکانی حزبو لە کوێ شێوازەکانی دەوڵەت بەکار دەهێنیو لە کوێ هەموویان لەرێگای خزمەتکردنی بیرو باوەڕەکان لە ناو حزبو دەوڵەتدا بەکار دەهێنی .

لە بواری دووپات کردنەوەوەداو بۆئەوەی دووپات کردنەوەکەش لەبەر ئەوەی کە لەپێشەوە و تر وەتەوە زامن بکرێ بەوەی ئەگەر بتوانرێ ئەرکمان لاوازترو کەمتربێ لەوەی کە لەسەرمانە بۆ جێبەجێکردنی بیرو باوەڕەکان تەنها لە عێراقدا ، بەڵام ئەمە نرخی ئەو پەیامەیە کە ئێوە لە ئەستۆتان گرتوەو مێژوو بە نیشانەی پرشنگداریاد ناکرێتەوە وەك ئەوەی یادی ئەو کەسانە دەکرێتەوە کە پەیامێکیان هەبوو لەو شوێنانە تێپەڕ دەکا کە تێیدان .. لەبەر ئەوە هەمیشە حساباتی ئەقلی بۆ ئەمە دەکرێ .

بەڵام ، وریابن هەرگیز حیساب بە ئەقڵێك مەکەن کە دووربێ لە هوروژمی خوێنی مرۆڤانەی بەسۆز کە پێویستە بۆ بەکار هێنانی ئەقڵ نەك بە شێوەیەکی بەرەودوا ، بەڵکو بەکار هێنانی بەشێوەو بەرێگای هێرش هێنان .

پێویستە هەمیشە وریای شۆڕشەکەتان بن ، بەڵام هەرگیز نەکەن واتێبگەن کە وریایی شۆڕش پێویستی بە پێویستنەبوون ، یان نائومێدی یان کوژانەوەی شۆڕش تەنها لە چوارچێوەی وڵاتدا .. دورکەونەوە لەسەرەڕۆیی ، بەڵام هەرگیز وانەزانن کە زات کردنتان تەنها بە بەدی هێنانی بیروڕا لە چوارچێوەی سنووری وڵاتەکەتانەوە دەوەستێ .. زۆر جار وریایی شۆڕش پێویستی بە سەرمڕویی حیساب بۆکراو لە پێناوی شۆڕشو بیروباوەڕدا هەیە .. بێ ئەمە ناتوانن ئەو پەیامە بهێننە دی کە بیروباوەڕو بەهاکانی دەزانن ، بەڵام هەرگیز بە هەڵە نەچن کە باوەڕ داری بە بیرو باوەڕپێویستی بە بەدەستدانی شۆڕش هەیە ، هەروەکو وتمان هیچ بیروباوەڕیك نیە بەبێ بوونی ئیرادەیەك کە بەدی بهێنێ .. کەواتە ، بیروباوەڕ بێ شۆڕشێك کە پشتگیری پێبکا ، بەم گیانە شۆڕشگێرانەیە ، نابێ .

هیوادارم سەر کەوتوبن بۆ خزمەتی گەلەکەتانو نەتەوە تانو حزبە کەتانو سوپا قارەمانەکەتان کە هیوایەکی زۆرمان پێی هەیە لە پێناوی خزمەت کردنی نەتەوەی عەرەبدا ، چونکە لەناو دەزگاکانی ئەم سوپایەدا باشترین تێکۆشەرانی حزبمان لە تاقیکردنەوەو رابردوی تێکۆشانو ئامادەیی ئێستا بۆ تێکۆشانو لە دوارۆژیشدا هەنو چونکە ئەم سوپایە لەلایەن سەرکردایەتیەکەتانەوە بایەخێکی تایبەتی دەدرێتێو چونکە هیوایەکی زۆر خراوەتە سەر ئەم سوبایە لە پێناوی راگەیاندنی ئیرادەی بێکەوە بەستانی ئیمان بە بیرو باوەڕەوە لە پێناوی گەیشتن بە ئامانج شتی زۆر .

# چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی چینی کرێکاری کورد

د. کەمال مەزهەر

دەگمەن نوسەرانی خۆمانو بێگانە بیریان لە کرێکاری کورد کردۆتەوە . دوورنەڕۆین لە هیچ کامێك لە بەرهەمەکانی مامۆستا ئەمین زەکی‌ی مێژوونوسی گەورەماندا زۆرو کەم ناوی کرێکاری کورد نەهاتوە . بێ‌گومان ئەمیش کەلێنێکی‌ترە لەو دەیان کەلێنانەی لە مێژووی نوسراوماندا هەن ، بەڵام کەلێنێکی گەورە ! . وابزانم لە راستی دورناکەومەوە گەر بڵێم ئەدەبی کوردیش ، بەداخەوە ، لەو کەلێنە بێ‌بەش نی‌یە . کرێکاری کوردیش وەك روناکبیرو جوتیارو هەموو خەڵکێکی‌تر خاوەن دڵو هەستە ، دڵی وەك هەموو کرێکارێکی‌تر سافو هەستی وەك ئەوان بەرزە ، ئەویش لە هەموان زیاتر ئارەق دەڕێژێتو لە هەموان هیلاكو بێ کاتترە،بۆیە کەمتر باسی خەڵك دەکاتو زیاتر لە هیلاکی‌و دەردو ئازارو نەبونی‌و بێ مافی دەگاتو حەز بە یاریدەی هەموو ئی‌قەوماوێك دەکات . تاڵ لای ئەو تاڵترو شیرین لای شیرینترە . لەزەت لە هەمو خۆراکێك دەبینێت . وەك هەموانو ، رەنگبێ زیاتریش، حەز بە چاوی کاڵو لێوی ئاڵو گۆنای پڕخاڵ دەکات ، کاتی بوایە ئەویش چاوباز دەبو ! . ژمارەیان زۆرو کێشەیان زۆرتر ، بۆیە ژیانیان پڕ لە چیرۆکی بێ هاوتاو داستانی دانسقەو تابلۆی رەنگینە ... حەیفە دەستی ئەدیبی کوردی دڵ بەرەی گوڵ کە تاڵاوی زوخاوی ژیان زاخاوی مێشكو قەڵەمی داوە ، زوو نەگاتە گەوهەرو ئەڵماسی ئەو خەزنە ددوڵەمەندە ! .

× × ×

لەم وتارەدا هەوڵ دەدەین بە کورتی چەند رویەکی سەرەتای دروستبونو هاتنەکایەی چینی کرێکاری کورد بخەینە بەرچاو کە دور نی‌یە سەرنجی خوێنەر راکێشن .

لە سەردەمی هەرە کۆنی شارستانەتی مرۆڤەوە کرێکارو کرێ‌گرتە هەیە . بەڵام هیچ کاتو لە هیچ شوێنێ ئەو کرێکارە پەرشو بڵاوانە نەبونەتە هێزی بنچینەیی هێنانە بەرهەم لە ناو کۆمەڵدا تا پەیدابونی سەرمایەداری‌ی . لەگەڵ ئەمیاندا دوو چینی نوێ دێنە کایەوە ــ بورجوازی‌و کرێکار . لەبەر ئەوەش کە پەیوەندی‌ی سەرمایەداری لە ئەورووپای رۆژئاوا بەر لە شوێنی‌تر دروستبو ، هەر لەوێش دەوروبەری سەدەی‌چواردەوپازدە بۆ یەکەمجار لە مێژووی ئادەمیزادا چینی کرێکار وەك هێزێکی دیاری کۆمەڵ هاتەناو(1) .

لە زوربەی ولاَتانی‌تر ، تایبەت لە رۆژهەلاَتی نزیك‌و ناوەراست ، پەیدابونی چینی کرێکار زۆر لەوە دواکەوت . جۆروهۆی دروست‌بونەکەشی گەلێك لە گەلَ ئەو جیاوازە . لە ئەوروپا ئاڵو گۆڕەکانی ناو کۆمەلَ چینی کرێکاریان دروست کرد ، بەلاَم لە ولاَتانی رۆژهەلاَت ئەو ئاڵو گۆڕانە لە هۆی تێکەڵبون بە بازاڕی سەرمایەداری‌یەوە کەمتر دەوریان بینی . لە سەدەی نۆزدەوە 'یشاوی تێکەڵبونی ولاَتانی رۆژهەلاَتی نزیك‌و ناوەراست بە بازاڕی سەرمایەداری‌ی جیهان دەستی‌پێ‌کرد . ئەمەو گەیشتنی ژمارەیەك دەسکەوتی پیشەسازی‌ی نوێی ئەوروپا بونە هۆی دارِشتنی بەردی بناغەی دروست‌بونی چینی کرێکاری‌زوربەی ولاَتانی ئەم ناوچەیە .

لە کوردستان ئەم دیاردەیە لەبەر دوو هۆی گرنگ تا رادەیەك لەو ولاَتانە دواکەوت ، یەکەمیان هێزی زۆری پەیوەندی‌ی دەرەبەگی‌و پاشماوەی ژیانی کۆچەری‌و نیمچە کۆچەری‌ی ناو کۆمەڵی کورد بو . ئەوی‌تریان نەبونی دەرەبەندێکی سەربەخۆ بو کە کەلوپەلی کوردستان‌و بەرهەمی هێنراوی پیشەسازی‌ی ئەوروپای تێدا کۆبێتەوەو پێویستی بە ژمارەیەکی زۆر کرێکارو چەند کۆمپانیایەك‌بێت .

بەلاَم بەرامبەر بەوە مەرجی‌تری پێویست بۆ دروست بونی ئەم چینە تازەیە لە ئارادابون . یەکەمیان دەولەمەندی‌ی کوردستانە کە بەرهەمی کشتوکاڵ‌و ئاژەڵی لە نیوەی دووەمی سەدەی‌نۆزدەوە گەیشتە چەند بازاڕێکی گرنگی ئەوروپا . کەلوپەلی دروست‌کراوی ئەوێش بەخێرایی گەیشتە کەلاترین شارو گوندی لای خۆمان . تەنانەت بەر لە نیوەی دووەمی سەدەی‌نۆزدە ئینگلیزەکان کۆمپانیای تایبەتی‌یان لە شاری وەك دیاربەکر دامەزراند . هەر لە خۆشەوە نی‌یە کە . ناپێیر پێش پەنجاساڵ شاری کرمانشای ناو ناوە بەندەری کەلوپەلی ئینگلیزی‌و هندی(٢) .

دووەمیان پەرەسەندنی شارە کوردەکان‌و بەهێزبونی پەیوەندی‌ی بازرگانی‌یان لەگەڵ شارانی‌ترو پێشکەوتنی پیشەسازی‌ی خۆمالی‌یانە . لەم روانەوە بۆ ماوەیەکی زۆر کوردستان شان‌بەشانی مەڵبەندەکانی‌تری رۆژهەلاَتی نزیك‌و ناوەراست هەنگاوی بەرەوپێش‌چونی دەنا . لە رێگەی ژمارەو بەراوردەوە دڵنیا دەتوانین بڵێین سەدەکانی ناوەند شارە کوردەکان لە گەلێك رووەوە وەك شارانی تری رۆژهەلاَت پەرەی‌دەسەندو قەوارەی خۆی وەردەگرت . گەریدەی تورکی ناودارو سەرچاوەی رەسەن ئۆلیاچەلەبی (١٦١١ – ١٦٧٩) کە ناوەندی سەدەی حەفدە هاتۆتە کوردستان لە بەرگی چوارەمی «سیاحەتنامە»کەیدا(٣) باسی گەورەیی ژمارەیەك شاری وەك دیاربەکرو بدلیسی کردووە . ئەو بازاڕو قەیسەری‌یانەی دیاربەکر کە ئەو باسیان دەکات ئەوسا لە زۆر ناوچەی رۆژهەلاَت کەم وێنەبون . هەر بەپێی قسەی ئەو دیاربەکر ١٢گەرماو (حەمام)ی گشتی‌ی تیابووەو (١٤٠) مالیش گەرماوی خۆیان هەبووە . بدلیس (٥) گەرماوی گشتی‌و (٦٠٠)ی تایبەتی‌ی تێدا بووە . ئەم ژمارەیەی دوایان بەڵگەی پڕ مانای دەوڵەمەندی‌ی‌و رەفاهەتە(٤) .

دوای ئۆلیاچەلەبی بە دەوروبەری ١٥٠ساڵێك نوێنەری ناوداری‌ئینگلیز لە عیراق کلۆدیۆس جێمس ریچ باسی چەند شارێکی‌تری کوردستانی کردووە . قسەکانی ئەویش بەڵگەی مێژوویین دەربارەی ئاڵوگۆڕو بەرەوپێش‌چونی شارە کوردەکان . سنەی بە(٥) هەزار ماڵ داناو، کە هەر جۆر لێکی بدەیتەوە لە ٢٠ هەزار کەس تێدەپەڕێ . مانای ژمارەیەکی وا زیاتر خۆ دەنوێنێت گەر بێتو بزانین ژمارەی دانیشتوانی شاری قودس ساڵی ١٨١٤ دەوروبەری ١٢هەزارو بەغدا ساڵی ١٨٣١ نزیکەی ٢٠هەزارو عەمانی پایتەختی ئوردونیش ساڵی ١٨٨٠ تەنها هەزارکەس بووە(٥) .

پەیوەندی بازرگانی‌ی نێوان شارەکانی کوردستان خۆی‌و ئەو مەڵبەندو ناوچانەی لێوەی نزیك بون بە پێوەدانی ئۆناغی‌دەرەبەگی خراپ نەبو . بە پێی سەرچاوە کۆنەکان تاوەکو سەدەی نۆزدەش ئەستەموڵ‌و دیمەشق‌و حەلەب‌و بیروت تا رادەیەکی زۆر بە مەڕو بزنی کوردستان بەڕێوە دەچون . تەنها شاری ئەستەموڵ هەر ساڵەی یەك ملیۆن‌و نیو سەرمەڕی لەوێوە بۆ دەهات . ئەو سوپا گەورەیەی بە سەرکردایەتی ئیبراهیم‌پاشای کوڕی محەمەد عەلی گەورەی فەرمانڕەوای میسر ساڵی ١٨٣١ – ١٨٣٣ و١٨٣٩ هێرشی بردە سەر سوریا بە مەڕوماڵاتی کوردەواری دەژیا(٦) . بەر لەوەی سەدەی رابوردو کۆتایی‌بێت تەنها ئەستەموڵ‌و حەلەب‌و بەغدا هەر

ساڵەی ٣ملیۆن مەڕی کوردستانیان بۆ دەهات . بەندەری سامسۆنیش بەتەنها ساڵی٠٢ملیۆن هێلکەی لەوێوە دەهانی(٧) . دروستکردنی پڕدی قلیاسانیش لەلایەن دەولەمەندێکی سلێمانییەوە تەنها کاری خێرنەبو ، ئەگینا دەبو بەر لە قلیاسان لە تانجەرۆ دروستی بکردایە چونکە ئەمیان ئاوی زۆرترو کاتی لافاو ترسدارترە .

بەهەمان دەستور پیشەسازیی خۆماڵی کوردستان بەر لە تێکەڵبون بە بازاڕی سەرمایەداریی جیهان هەنگاوی باشی بەرەوپێش ناو هیچی لە پیشەسازیی وڵاتانی دەوروبەری کەمترنەبو . جل‌وبەرگی نەتەوەییو ژمارەیەك نەریتی تایبەتی هەوێنی باشی ئەو بەرەوپێش‌چونەبون . دیسان لە بەرگی‌چوارەمی «سیاحەتنامە»کەی ئۆلیا چەلەبیدا گەلێك بەڵگەی پڕ بایەخو مانا لەم بارەوە ودچنگ دەکەون . بەقسەی ئەو لە هەمو جیهان وێنەی زەرەنگەری دیاربەکر کەمبووە . وەك دەڵێت کاری جۆلاو بەرگدروو دەباخانەکانی بدلیس دەنگی‌دابۆوە ، بە رادەیەك «چەرمی بە دیاری دەبرایە وڵاتی فەرەنگ» .

دوای دەوروبەری دووسەدە ، واتە ناوەندی سەدەی‌نۆزدە ، تایلەری گەڕیدەی ئەوروپایی لەو کتێبەیدا کە بە ناوی «گەشتێك بە کوردستاندا» بڵاوی کردۆتەوە باسی کوتاڵی ئاوریشمی دیاربەکر دەکاتو بۆ چاکی لەگەڵ ئاوریشمی بەناوبانگی حەلەب بەراوردی دەکاتو دەڵێت ئەویان هەرزانتر دەفرۆشرێت بۆیەکا لە هەموو ئەو ناوچانەی کەوتونە نێوان دیاربەکرو دەریای ڕەش بازاڕی گەرمە(٨) . ناونانی گەڕەکی شارێکی وەك سلێمانی بە (سابونکەران) شتێکی ماناداره بۆ ئەم مەبەستەی ئێمە باسی 'یوە دەکەین .بەرلە شەڕی یەکەمی‌جیهان بە ماوەیەك دەیان خێزانی ئەم گەڕەکە بە دروستکردنی سابونەوە خەریك‌بون(٩)و ساڵی بە لای‌کەمەوە ..٥تەنیان ئەناردە بازاڕەکانی شارو دەوروبەری‌و چەند مەلبەندێکی‌ترو تەنانەت لێشی دەگەیشتە شاری وەك بەغداو تەورێز(١٠) .

لە کوردستانیش بە چەشنی ناوچەکانی‌تری رۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست تێکەڵبونی خێرا لە نیوەی دووەمی سەدەی رابوردووەوە بە بازاڕی سەرمایەداریی جیهان کاری کوشندەی کردەسەر پیشەسازیی خۆماڵی کە تاك‌تاکە خەریك‌بو هەنگاو بەرەو قوناغی مانیفاکتور(١١)بنێت .کاری بنەماڵەی موتابچی‌کە لە سلێمانی جەوالیان‌دروستدەکرد نیمچە مانیفاکتۆرەیەك بوبۆ خۆی : کرێکاری کرێ گرتەکاری تێدادەکرد ، ئەمرازی تا رادەیەك پێشکەوتویان بەکاردەهێنا ، دابەش‌کردنی کار (تقسیم العمل)(١٢) تێیدا سیمای رونی خۆی وەرگرتبو(١٣) . جۆری دروستکردنی تۆپەکانی وەستا رەجەبیش لە ڕەواندوز نمونەیەکی‌تری ئەم راستی‌یەیە . شۆرەتی تۆپەکانی کە بۆمیری رەواندوزی دروست دەکردن دەنگی‌دابۆوە(١٤) . زۆری ئەو ٨٠تۆپەش کە والی موسڵ هەیبو لە دەستکردی کرێکارانی رەواندوزبوون. شایانی باسە ئەو مەعدەنەی بۆدروستکردنی تۆپەکان بەکاردەهێنران لە دەوروپشتی رەواندوز بەکاری کرێکاری کرێ‌گرتە دەردەهێنران(١٥) . لە مەیدانی دروستکردنی بەڕەو جاجمو چۆخیشدا خەریك‌بو وردە ئاڵ‌وگۆڕ دەست‌پێ‌بکات .

بەڵام تەنانەت ئەم جۆرە پیشەسازی‌یانەش نەیانتوانی خۆیان لەبەر لێشاوی کەلوپەلی هەرزانو چاکتری کارگەکانی ئەوروپادا رابگرن ، بۆیەکایەك لە دوای یەك دامودەزگایان پێچایەوە . کارتسۆف ساڵی١٨٩٦ نوسیویە دەڵێت : «جاران چۆخی کورد بەناوبانگ‌بو ، بەڵام ئێستە کوتاڵی ئینگلیز بە جارێك تەنگی پێ هەڵچنیوە »(١٥أ) .

ئەو یەك دوو دوکانی فیشەك پڕکردنەوەیەی دوای شەڕی یەکەمی‌جیهان خاوەنەکانیان لە سلێمانی بە کوڵەمەرگی دەیان پاشماوەی ١٥٠ دوکانی لە خۆیان گەورەتربون کە بەرلە شەڕ مارك‌سایکس لەوێ دیبونی(١٦) .

هەرچۆن‌بێت لەو جۆرە شوێنانەی بە کاری پیشەسازیی خۆماڵی‌یەوە خەریك بون‌و هەنگاوی باشیان بەرەوپێش نابو یەکەم تۆێکڵی تەنگی چینی کرێکاری کورد بەدی‌دەکرێت . لە لایەکی‌ترەوە قەزای ئەو پیشەسازی‌یە لە چینی داهاتۆی کرێکاری‌کورد کەوت ، چونکە بەشی زۆری کارکەرانی چونە ناو ریزەکانی ئەو . چەوساندنەوەی دەرەبەگیش لەلای خۆیەوە بەهەزاران جوتیاری روت‌وقوتو برسیی نارده بازاڕی کار لە شارەکان‌و ئەوانیش ، تایبەت لەبەر هەرزانی یان ، بونە سەرچاوەی هەرە گرنگی دروستبونی چینی نوێی کۆمەڵ . ژمارەی ئەم جۆرە

کەسانە کە لە هەندێك ناوچە هەزاریان پێ دەگوتن ، جاری وا هەبو پتر لە نیوەی دانیشتوانی مەڵبەندێکیان پێکدەهێنا . بەپێی هەندێك سەرچاوە ئەوانە لە ناوچەیەکی وەك شنۆ (ئوشنۆ)ی نزیك مەهاباد ٨٠٪ی هێزی کاریان دروست دەکرد (١٠هەزار لە ١٢هەزار کەس)(١٧) . لە وێنەی ئەمە تەنها مەگەر لە ئینگیلتەرەی کۆتایی سەدەکانی ناوەند هەبوبێت کاتێك بەهۆی قازانجی زۆری خوری‌یەوە دەوڵەمەندو دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتە زەوی‌یەکانیان دەکردە لەوەڕگەو بەو جۆرە بە دەیان‌هەزار جوتیار بێ داڵدەو پەناگەدەمانەوەو ئاوارەی دارستان‌و دەشتو دەرو شاران‌دەبون‌و بەگژوگیاو پاشماوەی خەڵکی دەژیان‌و ئەمەش هەستی تۆماس مۆری(١٨) بەناوبانگی وا بزواند «یۆتۆپیا» بنوسێت‌و قسە بەناوبانگەکەی بکات: «خەریکە مەڕ پیاو بخوات» . لێرەدا سەیر ئەوەیە کە دەردو ئازاری هەژارانی کوردیش هەستی شبرۆتی شاعیری جوڵاندووەو باسی ئەوەی کردووە چۆن «برسێتی لە کوردستان زۆری بۆهەموان هێناوەو بە ڕەوە بەرەو فابریقەکانیان(١٩) دەنێرێت»(٢٠) .

ژمارەی هەژاری شارو تایبەت لادێی کوردستان هێند زۆربو لەوانەنەبو بازاڕی کەم دەرامەتی ناو وڵات دادی‌بەشێکی زۆر کەمیشی بدات. لە قوڕکاری‌و حەماڵی بەو لاوە کارێکی‌تری ئەو تۆ دەست نەدەکەوت . لەبەر ئەوە بە هەزاران هەژاری کورد رویان دەکردە شاری گەورەی وەك ئەستەموڵ‌و بە هەمو کارو نرخێك قایل دەبون (بەر لە شەڕی یەکەمی‌جیهان ژمارەیەکی بێ شومار لە حەماڵی ڕەش‌و روتی کورد بازاڕی ئەستەموڵ‌و بەغداو شاری تریان تەنی‌بو ) . هی وایان هەبو لە تاو نەبونی دەچونە شاری بچوکی وەك حەلەبی شام‌و بێروتی لوبنان‌و ئەدەنەی تورکیا ، یا ناوچەی وەك ئاقچەو قەرەبلغی ئازەربایجان . بەڵام توانای بازاڕی کاری ئەو جۆرە ناوچەو شارانەش ئەوەندە نەبو دادی ئەو خەڵکە زۆرەبدات کە دەبونە سەرباری بێ‌کارەی خۆیان . بۆیەکا هەر نوو ژمارەیەکیان ناچار چاویان بڕی‌یە وڵاتانی دەرەوەو خۆیان دایە دەست قەدەرو گەڵێکیان دەریای ئەتلەسی‌یان بڕی‌و گەیشتنە خاکی ئەمەریکا . زوربەی ئەمانە خەڵکی دەرسیم‌بون(٢١) .

بونی کانە مەعدەن لە ناوچە کوردەواری‌یەکان‌و دەوروبەری هۆیەکی یاریدەری‌تری پەیدابونی کاری‌کرێ گرتەبو لەوێ بەر لە شەڕی یەکەمی‌جیهان. ئەوسا بەشی زۆری کرێکارانی کانە خەڵوزەکانی زدنگولداك کوردبون . کوردی جۆلەمێرگیش ئاسن‌و مس‌و زەرنیخیان دەردەهێناو لەوەوە ناوی یەکێك لە ناوچەکانی بۆتە زەرنیخ مەیدان . بەشێك لەو زەرنیخەی لێرە دەردەهێنرا دەنێررایە بازاڕی دەرەوە. بەپێی ژمارەیەك سەرچاوە سالی ٣٠ هەزار قەنتاری لێ دەنێررایە ئەستەموڵو بەغداو هیندستان(٢٢) . هەر ئەو سەردەمە ژمارەیەك کورد بوبونە کرێکاری کانە خەڵوزەکانی نزیك کفری کە بەرهەمی ساڵانەی کاریان بەر لە شەڕی یەکەم‌و کاتی ئەو شەڕە هەزار تەن‌دەبو(٢٣) .

روداوەکانی شەڕی یەکەمی‌جیهان بونە هۆی پەرەسەندنی ژمارەی کرێکاری کورد بەجۆرێکی هەست‌پێ‌کراو . کوردستان بۆ خۆی بووە یەکێك لە شەڕگە دیارەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستو سوپای چوار وڵاتی تێ‌رژا . ئاگری شەڕ زوربەی ئەو ناوچانەشی گرتەوە کە لێودی نزیكبون . وەك ئاشکراشە تەکنیك‌و خێرایی دەوری گەورەیان لەو شەڕەدا بینی ، بۆیەکا لە هەر چوار لاوە دەست‌کرا بە کردنەوەی ڕێگەو بان‌و دامەزراندنی بنکەی سەربازی. بە هەزاران هەژاری کورد لەو شوێنانە بونە کرێکار . ئەم دیاردە نوێیە بە تەواوبونی شەڕ کۆتایی‌نەهات . هەر بۆ نمونە سالی ١٩٢٥ پتر لە ٢٢٥٠ کورد کرێکاری شەمەنەفەر بون لە عیراق(٢٤). بە پێی هەندێك سەرچاوەی باوەڕ پێ‌کراو ناوەندی بیستەکان ئەو کرێکارانە ٢٣٪ هەمو کرێکارانی شەمەنەفەری عیراق بون(٢٥) . زۆری‌ی ئەم ژمارەیە زیاتر لەوەدا خۆ دەنوێنێ گەر بێتو بزانین زوربەی هەرە زۆری خەتی شەمەنەفەری ئەوسای عیراق لە باشورو ناوەندی وڵاتدا بون ، وە جگە لە عەرەب(٢٦)و کورد ژمارەیەکی زۆر هندی‌ی (١٤٢١)و ئێرانی‌و ئەرمەن‌و ئاسوری‌و تورکو هی تر کرێکاری ئەو دەزگایە بون .

دیسان دوای شەڕی یەکەمی جیهان ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە هەژاری کورد بونە کرێکاری نەوت‌و دامەزراندنی لولەکانی‌و دروست کردنی ڕێگەوبان‌و خانوبەرەو شتی تر . کۆتایی بیستەکان لە هەمو عیراق ٤٢٥٠ کەس بە دروست‌کردنی ڕێگەو بانەوە خەریك بون(٢٧) کە ژمارەیەکی زۆریان کرێکاری ڕێگەی نێوان

کەرکوکو سلێمانیو کەرکوکو هەولێرو هەولێرو موسڵو هەولێرو رەواندوز ــ رایاتبون . ئینگلیز بایەخێکی زۆریان دابو بە رێگەی دواییان ، واتە هەولێر ــ رەواندوز ــ رایات ، چونکە جگە لە بایەخی ستراتیجی دەیانویست بیکەنە یەکێك لە هۆکانی زیاتر بەستنەوەی بازارەکانی رۆژئاوای ئێران بە جیهانی سەرمایەداریەوە ، تا چەند بتوانن ئەوەندە پەیوەندی ئابوریی ئەو وڵاتە لەگەڵ شورەوی کزبکەن(٢٨) .

کرێکاری کورد یەکسەر دڵسۆزیو پەرۆشی لە کارداو توانای فێربونی خێرای نیشاندا . گەلێك بەڵگەی سەیر بۆ ئەم راستییە بە دەستەوەیە . وابزانم لە هەمویان گرنگتر لەم لایەنەوە یەکگرتنەوەی نرخاندنی کاربەدەستانی ئینگلیزو ئەڵەمانە لە کاتێکدا کە لە دوو خەندەقی جیاوازدا بەرامبەر بە یەك وەستا بون . ئەڵەمانەکان سەرەتای شەڕی یەکەمی جیهان دەستو برد کەوتنە دروست کردنی ئەو بەشانەی پرۆژەی ناوداری خەتی شەمەنەفەری بەغدا کە هێشتا تەواو نەبوبون . بەو جۆرە خەتێکیان لە نێوان بەغداو سامەڕەدا راکێشا کە کرێکاری کوردیش لە دروست کردنیدا بەشدار بون . نوسەری ئەڵەمانی داگو بێرت لەم باردوە نوسیویە دەڵێت :

ئەندازیارە ئەڵەمانەکان لە کوردا «باشترینو دڵسۆز ترین کرێکاریان دیبەوە»(٢٩) .

جەنەراڵ هالدێنی فەرماندەی هێزەکانی ئینگلیز لە عیراق دوروبەری هەمان کات بێ ئەوەی بزانێ داگو بێرت کێیە ، یان رای ئەندازیارانی ئەڵەمان چییە ، بە هەمان دەستور باسیکرێکاری کوردی کردووەو رەزامەندی زۆری بەرامبەریان نیشان داوە(٣٠) هەر لەبەر ئەوەش هیچ سەیر نییە رۆژانەی کرێکاری کورد لە هی تر زیاتر بو . ئەوسا هەندێك دەزگا رۆژی نزیکەی ٢١ ئانەی دەدا بەو بەرامبەر بە ١٤ ئانەکە هیوطك ئەو وەریان دەگرت(٣١) . لەودش مانادارتر ئەم نمونەیەی ترە : دەزگای شەمەنەفەری ئینگلیز لە عیراق لە بیستەکاندا دوو جۆر کرێکاری هەبو ، یەکەمیان ئەو کرێکارانە بون کە بەکاری ئەساسییەوە (Capital Works) خەریك بون ، دووەمیشیان ئەوانەیان بون کە کاریان لە دروست کردنی خەتی تازەدا دەکرد . ساڵی ١٩٢٤ ــ ١٩٢٥ لە ٢٧٤ر٢ کرێکاری شەمەنەفەری کورد تەنها ٧٢٩یان لە جۆری دووەم بونو ئەو باقییەکەیان ( ٥٤٥ر١ کرێکار ) لە جۆری یەکەم بون(٣٢) .

دیارە ئەم راستییە نەبووە هۆی ئەوەی تاڵاوی چەوساندنەوەی کرێکاری کورد لە هی هاوەڵەکانی کەمتربێت . بەڵکو بە پێچەوانەوە ژمارەیەك نمونەی هەر ئەو سەردەمەوای نیشان دەدەن کە هەندێك جارو لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی ئەو چەوساندنەوەیە توندتر بووە . لە گشت ناوچەکانی باکوری عیراق رۆژانەی کرێکار لە ناوچەکانی تر کەمتر بو . بە وێنە کرێکارانی کومپانیاکانی نەوت دەبو حەفتەی ٥٤ سەعات کار بکەنو بەرامبەر بەوە ٧تا ١٠ روپیەیان وردەگرت ، کەچی کرێکاری چنین لە بەغداو کرێکاری بەندەری بەسرە حەفتەی ٤٨ سەعات کاریان دەکردو بەرامبەر بەوە هەر یەکەیان ٣ تا ٦ روپیە زیاتریان لەوان وەردەگرت(٣٣) . باری کارو رۆژانەی ئەو کرێکارە کوردانەی بە دروست کردنی خانوبەرەو رێگەو بانەوە خەریك بون گەلێك لەوەیش خراپتربو . ئەوانە زۆر جار مەلاباتگان دەچونە سەرکارو لەگەڵ بانگی شێواندا دەستیان لێ هەڵدەگرتو بەرامبەر بەو هەمو کارە رۆژی ١٨ فلسیان وەردەگرت کە وەك ئینگلیزەکان خۆیان دانی پێدا دەنێن ئەو پارەیە تەنانەت « بەشی نانو جگەردی نەدەکردن »(٣٤) .

وێڕای ئەوە کرێکاری کورد ، وەك کرێکاری ناوچەکانی تر ، ماوەیەکی دورو درێژ نەیتوانی خۆی لە پەیوەندیو نەریتی دەرەبەگی قوتار بکات . زۆر جار ئەو کرێکارانە دەگەڕانەوە گوندەکانیان بۆ کاری کشتوکاڵو یاریدەی کەسوکاریان . زوربەیان بەشێکی داهاتی کرێکاریی خۆیان هەر وەك جاری جاران دەدا بە ئاغاو سەرەك هۆزەکانیان .

بەر لە کۆتایی با ئەوەش بڵێین کە کرێکاری کورد لە سەرەتای سەرەتاوە بە گیانی برایەتی گۆش بووە ، چونکە هەمیشە چ لە خاکی خۆیو چ دوور لێی شان بە شانی کرێکاری تر کاری کردووەو ئازاری چەوساندنەوەی چێشتووە . جوانترین بەڵگەی ئەم راستییە رەنگبێ ئەو قسانە بن کە لەگەڵ تەواوبونی رێگەکەی هەولێر ــ رەواندوز ــ رایات لەسەر تاشە بەردێك نوسیویان :

« ئێمە کە هەزاران کەسینو بە عەرەبیو ئەرمەنیو ئینگلیزیو هندیو کوردیو روسیو تورکی قسە دەکەین ئەم رێگەمان بۆ خزمەتی هەمو

گەریدەیەکی بێ وەی دروسنت کرد ! »(٣٥) .

لیســـــتەی ناوی ئـــەم زماناتــە لــە دەزگای شــەمەنەفەری عیراق دەگاتە ١٦ ناو . جگە لەوانەی سەرەوە ئەم ناوانەشی دەچنە سەر: سریانی‌و میسری‌و فارسی‌و تونسی(٣٦)و ئیتالی‌و یۆنانی‌و هەنگاری(٣٧) . لە گاورباغیش هاوینی ســالی ١٩٤٦ دەنگی زولاڵو خوێنی گــەشی کرێکاری کورد تێکەڵ لەگەڵ دەنگ‌و خوێنی پیرۆزی براکانی ئاوازێکی بە جۆش‌و لاپەڕەیەکی پڕ شانازی‌ی دروست کرد !

**پەراوێزەکان :**

(١) بۆ یەکـــەم جار لـــە مێژووی ئادەمیـــزادا پەیوەندی‌ی سەرمایەداری لە فلۆرەنســەی ئیتالیــا دروست بو ، بۆیەکا لەوێش یەکەم چەکەرەی هەردوو چینی نوێی کۆمەڵ ــ پرۆلیتاریاو بۆرجوازی پەیدابو .

(٢) G. Napier, The Road from Baghdad to Baku, - «The Geographical Journal», London, Vol. L111, No1, January, 1919, P.18.

(٣) ١٠ بەرگەو سەرچاوەیەکی گرنگو ڕەسەنە بۆ باسی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست لـــە دەوروبەری کۆتایی سەدەکانی ناوەندا . ئۆلیا چەلەبی بەشی زۆری تەمـــەنی بە ناوچـــەکانی ئیمپراتۆری‌ی عوسمانی‌و چەند وڵاتێکی ئەوروپاییدا گەڕاوە .

(٤) بە پێی قسەی شەمســـــەدین سامی ژمارەی دانیشتوانی میرنشینی بدلیس ٣٠ هەزار کەس بو . سەرچاوەی تر بە دەوروبەری ٥٠ هەزاری لە قەڵەم دەدەن ( بڕوانە : شمس الدين سامی ، قاموس الاعلام، بەرگی دووەم ، ل ١٣٢٩ ، م . ی . شـــەمسی ، شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی وەك ســـەرچاوەی مێژووی گەلی کورد ، باکو ، ١٩٦٧ ، ل١٦ ) .

(٥) بڕوانە : ا . ن . کاتلۆف ، پەیدابونی بزوتنەوەی نەتەوەیی ــ ڕزگاری خواز لە ڕۆژهەڵاتی عەرەب ، بە زمانی روســـی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٥ ، ل٩٠ ــ ٩١ . ژمارەی دانیشتوانی عەمانی پایتەختی ئوردون ئیمڕۆ لە ملیۆن تێدەپەڕێ .

(٦) بۆ ئەو ژمارانـــە بڕوانە : پیۆتـــەر لێرخ ، لێکۆڵینـــەوە دەربارەی کوردی ئێران‌و کلدانی‌یەکانی باکوری باوو باپیریان ، بە زمانی روسی ، کتێبی یەکەم، پەتروسبورگ ، ١٨٥٦ ، ل ٢٤ .

(٧) بڕوانە : B. Nikitine, Les Kurdes, Paris, 1956, P. 185;
A. R. Ghassemlou, Kurds and the Kurdistan, Prague, 1965, P. 104.

(٨) بڕوانە : و . ل . ڤلچێڤسکی ، ژیانی ئابوری کوردە کۆچەرەکانی پشت قەفقاس‌و ناوچەکانی نزیکی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە ، بە زمانی روسی ، ــ گۆڤاری «ئەتنۆگرافیای سۆڤیەتی» ، ژمارە ٥ ــ ٦ ، ١٩٣٦ ، ل ١٥٠ .

(٩) بە پێی سەرژمێری سالی ١٩٤٧ لـە سلێمانی تەنها پێنج شەش کەس بە دروستکردنی سابونەوە خەریك بون ( بڕوانە : «احصاء السكان لسنة ١٩٤٧» الجزءالثاني ، بغداد ١٩٥٤ ، ص ١٦٣ ) .

(١٠) جگە لە سابون بەرهەمی تری پیشەسازی‌ی خۆمالی کوردەواری دەگـەیشـــــتە شارو وڵاتی تر ( بڕوانـە : R. Berliner and P. Borchardt, Silberchmidsarbeiten ans Kurdistan, Berlin, 1922, P. 8).

(١١) مانیفاکتۆرە زاراوێکە لە دوو وشـەی لاتینی پێك‌هاتووە : (Manus) واتە دەست‌و (Factura) واتە دروستکراو . گەیشتنی پیشەسازی‌ی خۆمالی بە قۆناغی مانیفاکتورە یەکـەم هەنگاوی گرنگە بەرەو پەیوەندی‌ی سەرمایەداری . مانیفاکتورە بە عـەرەبی « ورشـە »یە .

(١٢) لەگەڵ پەیدابونی پەیوەندی سەرمایەداری‌ی دابەش‌کردنی کار زیاتر چەسپ دەبێت . بەر لـــەو قۆناغە یەك کەس یا ئـەندامانی یـەك خێزان هەمویا زوربەی کاری دروستکردنی بەرهەمێکیان دەگرتـە ئەستۆ . دابەش‌کردنی کار دەبێتـــە هۆی زۆرو چاك بونی بەرهەم .

(١٣) دوکتۆر ئەمـــین موتابچی ئەو باسەی بـــۆ گێڕامەوە ، خۆشـــی نیازی‌یە وتارێك لەو بارەیەوە بنوسێت .

(١٤) تۆپی وایان تێدا بو درێژی‌یەکەی لە ٣ مەترو لولەکەی لە ٤٥ سانتیم کەمتر نەبو .

(١٥) بڕوانە : انور المائی ، الاكراد فی بهدینـــان ، موصل ، ١٩٦٠ ، ص٣ .

(أ١٥) ا . کارتسۆڤ ، تێبینی دەربارەی کورد ، بە زمانی روسی ، تفلیس ، ١٨٩٦ ، ل٢٤ .

**بەزۆر فێرکردن**
**ئاواتێکی**
**شۆڕشگێڕانەیە**
**بۆ لەناوبردنی**
**نەزانین و**
**دواکەوتن**

(١٦) بڕوانە : C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs, London, 1957, P. 80.

(١٧) بڕوانە: گ.ب.ئاکۆپۆف ، دەربارەی سروشتی زەویداریی تایبەتیی کوردستانی ئیمڕۆ ، ـ گۆڤاری « هەواڵەکانی کۆڕی زانیاری ئەرمینیای سۆڤیەت » ، بە زمانی روسی ، یەریڤان ، ژمارە ٥ ، ١٩٦٤ ، ل ٦٧ .

(١٨) سیاسیو نوسەری بەناوبانگی ئینگلیز تۆماس مۆر ( ١٤٧٨ ـ ١٥٣٥ ) بە دامەزرێنەری بیری سۆشیالیزمی یۆتۆپی (الاشتراکیە المثالیە) دادەنرێت.

(١٩) دیارە مەبەستی فابریقەکانی دەرەوەی کوردستانە .

(٢٠) بڕوانە : گ . ب . ئاکۆپۆف ، سەرچاوەی براو ، ل ٦٧ .

(٢١) بڕوانە : و . ڤلچێڤسکی ، دەربارەی پەیوەندی کشتوکاڵ لە کوردستان ، گۆڤاری «کێشەکانی کشتوکاڵ»، بە زمانی روسی ، مۆسکۆ ، بەرگی ١ـ٢ ، ١٩٣٢ ، ل ١٣٠ ، موسی کاظم پاشوزادە ، الحان ، عادات اکراد ، استانبول ، ١٩٢١ . دوکتۆر ناجی عەباس بۆی گێڕامەوە کە کاتی خۆی لە شاری دیترویت توشی ژمارەیەك لەو کرێکارە کوردانە هاتووە .

(٢٢) بڕوانە : و . ل . ڤلچێڤسکی ، ژیانی ئابوری کوردە کۆچەرەکانی پشت قەفقاس ، ل ١٥١، و . ل . ڤلچێڤسکی ، دەربارەی پەیوەندی کشتوکاڵ لە کوردستان ، ل ١٣٠ .

(٢٣) بڕوانە : عبدالرزاق الحسنی ، العراق قدیما وحدیثا ، الجزء الثانی ، صیدا ، ١٩٥٨ ، ص ٦١ .

(٢٤) بڕوانە : "Iraq Railways. Administration Report for the year 1924-1925", Baghdad, 1925, P. 16.

(٢٥) بڕوانە : "Report by Britannic Majesty's Government to the Council of the League of Nations on the administration of Iraq for the year 1926", London, 1927, P. 29.

(٢٦) ژمارەیان ٥٩.ر٤ کەس بو ، واتە دو ئەوەندەی کورد کەمتر .

(٢٧) بڕوانە : "Report gy His Majesty's Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the administration of Iraq for the year 1931", London, 1932, P. 66.

(٢٨) بە هۆی نزیکیەوە بازرگانی نێوان روسیاو ناوچەکانی قەفقاس هەر لە زووەوە زۆر گەرم بو .

(٢٩) Dagobert von Mikusch, Mustafa Kemal between Europe and Asia, trans. by J. Linton, London, 1931, P. 360.

(٣٠) بڕوانە : A. L. Haldane, The Insurection Mesopotamia 1920, London, 1922, P. 108.

(٣١) بڕوانە : المرکز الوطنی للوثائق ، بغداد ، رقم الملف : 80/19, Establishment General

(٣٢) "Iraq Railways. Administration Report for the year 1924-1925", P. 16.

(٣٣) بڕوانە : "Report for the year 1926" P. 29.

(٣٤) A. M. Hamilton, Road through Kurdistan. The Narrative of an Engineer in Iraq, London, 1937, P. 61.

(٣٥) بڕوانە : J. Morris, The Hashemite Kings, London, 1959, P. 97.

(٣٦) دیارە لێرەدا مەبەست لە میسریو تونسی وڵاتە نەك زمان .

(٣٧) "Iraqi Railways. Administration Report for the year 1924-1925", P. 16.

# گەڕانێك بە ناو كەشكۆڵێكدا

محەمەد عەلی قەرەداغی

پاش ئەوەی چەند كەشكۆڵو بەیاضی شاعیرانی كوردم خوێندووەتەوەو ئەمسەرەو سەرم كردوون ئەوەم بۆ دەركەوتووە لەو دەسخەتانەدا تا ئێستا من دیومن ڕێبازێكی تایبەتی نیە نووسەرانی ئەو دەسخەتانە پەیڕەوی بكەن ، وەك ئەوەی هەر شیعری شاعیرانی كورد بنووسنەوە ، یان هەر شیعری شاعیرە ناسراوو ناودارەكان بنووسنەوە ، یان ... شێوەیەكی تر . بەڵكو ئەوەی دەردەكەوێ ئەوەیە هەر كەشكۆڵێك مابێ ئەنجامی زەوقو هەستو بیری نووسەرەكەیەتیو بەس .

گەلێ جار نووسەر بەرهەمی شاعیری ناوچەكەی خۆی ـ بێ قەیدو شەرتو جیاوازی ـ كۆدەكاتەوە. جاری وایش هەیە هەرچی بەر دەست كەوتبێ : شاعیری ناوچەی خۆیو ناوچەكانی تر ، شاعیری كوردو فارسو عەرەب ، كۆنو تازە ... هەمووی لە ناو كەشكۆلەكەیدا خڕكردوونەتەوە . وەك جاری وایش هەیە نووسەری دەسخەتەكە ـ خۆی ـ سەر بە كۆمەڵو ڕێبازێكی ئایینی یان قوتابخانەیەكی شیعرییەو لەو پێودانەوە دەسخەتەكەیشی ڕەنگدانەوەی ئەو هەستو بیرەیەتیو شیعری ئەو شاعیرانەی تێداكۆكراوەتەوە كە هاوبیری نووسەرەكەن . لەم ماوەیەدا دۆستێكی خوێنەویست پاشماوەی كەشكۆڵێكی كۆنی پیشاندام كە سەرەتاو كۆتایی نەماوەو ناوی نووسەرو مێژووی نووسینەوەی نازانرێ . بەڵام ئەوەی كە زۆر ڕوونە تێیدا ئەوەیە نووسەرەكەی سەر بە ڕێبازی تەصەووف بووەو موریدی (فەوزی) شێخ عومەری بیارە بووەو لەو ماوەی كەشكۆلەكەیدا ـ كە نزیكی ١٠٠ لاپەڕەیە ـ كە ماوەتەوە شیعری ئەو شاعیرانەی كۆكردووەتەوە كە بە شانو باڵی ئەو ڕێبازەباندا هەڵداوەو شیعریان بۆ شێخ عومەر وتووە ، ئیتر سەری لەوە نەكردووەتەوە شیعرەكان بە زمانی فارسی یان كوردی بن ، یان بە لەهجەی گۆرانی یان سۆرانی بن .

شتێكی كە لەو كەشكۆلەدا جێگەی ڕێزو سەرنجە ئەوەیە : نووسەرەكەی وریاو ورد بووەو بەرهەمی هەر شاعیرێكی نووسیوە بە گوێرەی ئاگاداری خۆی ناویو ناونیشانی ڕوون كردووەتەوە .. لە بەر ئەوەی ئەم كەشكۆلە پەردە لە سەر ناوی چەند شاعیرێك لادەدا كە ڕەنگە تا ئێستە هیچیان دەربارە نەنووسرابێتو بەرهەمی شیعریان بلاونەكرابێتەوە ، لێرەدا ناوی ئەو شاعیرانە دەنووسمو دوایش نموونەیەك لە بەرهەمی ـ كوردی ـ ئەو شاعیرانە دەنووسم كە شیعری كوردیان لەو كەشكولەدا نووسراوە .

بەلگەیەكی وریایی نووسەر لەو كەشكۆلەدا ئەوەیە پارچەیەك شیعری نووسیوە بە تەواوی لێی ڕوون نەبووە هی كام شاعیرە تەنها ئەوەندە هەیە لە كۆتاییدا ناوی (ئەحمەد)ێك نووسراوە ، نووسەریش دەڵێ : نازانم هی كێیە ، بەلآم ڕەنگە هی سەید ئەحمەدی كوڕی نەقیب بێت . منیش لێرەدا ئەو پارچە شیعرە وەك نموونەیەك بە تەواوی پێشكەش دەكەم و دوای ئەو نموونەكانی ترو دوای ئەوانیش ناوی شاعیرەكانی دیكە .

پارچە شیعرەكەی (ئەحمەد) :

**ئەوا یاران هەموو ڕۆیین بەبێ جێ من بەجێ ماوم**
**دلم ڕەش ، ڕەنگو ڕوو زەردم ، سپی بوو دیدەكەم ، چاوم**
**شەرابی كەنسی دونیا وا دەماغو كەللەی پڕ كرد**
**بە سەرمەستییو سستی من هەمیشە كاسو تاساوم**
**عەجەب ماوم كەوا ماوم لە بەر سۆزو بلێسەی دڵ**
**لە سایەی ئاوی چاوی خۆمەوە هێشتا نەسووتاوم**
**لە باڵی بێتە عەرشی حەقو جێگەی سیرڕی سوبحانی**
**دلم بتخانەیی ئەغیارە بۆ دنیا كە بڕژاوم**

**مەتاعی ئابڕووم هێنند سەوقی سووقی نامورادی کرد**
**لـە دوککانی ضـەرەردا دەسـتەو ئـەژنۆ داماوم**
**بە ناری حیرصی دونیا خەرمەنی ئەعمالی من سووتا**
**لە بەر کوێری بەصیرەت خۆم نەدیوە چەندە شێواوم**
**بە دەست شەیطانەوە حەیرانو بوومە مەلعەبی صوبیان**
**لە بەحری فەسوەتا کـەشتی شـکاوم ماتو خنکاوم**
**بە رۆژووم تێ دەگەن جەمعێ ! ئەسەفەمە چونکە نازانن**
**لە بەر حەیاوولەتی ئەرضی مـەعاصی مانگی گیڕاوم**
**بە خۆبادانی بێ هوودەم ئـەوا مـەعلوومە نادانـم**
**نییە فەهمم کە تۆزێ تۆزەو چـەند قـەطرەیێ ئاوم**
**بنازم بەم هەموو حیلمی خودایـەو لوطفی پێغەمبـەر**
**کە بەم زۆری گوناهە من بـە روو وەك ئادەمی ماوم**
**ئەمەیش نەوعە ریاییکە دەمو دڵ یەك نەبێ (ئەحمەد)**
**لـە دیوانی ئـەدەبدا بۆیـە وا مـەحوە قسـەو ناوم**

نموونـەی شـیعری کوردی (حـەزین) مـەلا عـەبدوڵلای بچـووك کوڕی حاجی مـەلا صـالحـی (چەمەکی) :

**چون ئیرادەی حەق وەها بوو بێتە دەر دوڕڕی یەتیم**
**شاە عومەر رۆی چو لە بەحری مەعریفەت بێ فیکرو بیم**
**ئەو لە بەحری عیشقی حەقدا موددەتێ غەوواص بوو**
**کەوتە دەستی مەعدەنی دوڕڕ هاتە دەر شێری عەلیم**
**ئینتیخابی کرد لە ناو ئەقسـامی دوڕڕا جـەوهەرێ**
**گەوهەری خالیص لە غەششو میثلی ئەو ئەصلا عەدیم**

نموونەی شیعری کوردی (نەقشی)

**رەفیقان ! بێنەوە بگرین بە دڵ وەك هەوری نەیسانی**
**دەڵێن خۆ هیجرەتی فەرموو لە دونیا قوطبی رەببانی**
**موسولمانان ! چ حاڵێکە کە عالەم بۆتە بەحری غەم ؟**
**مەگەر دووبارە لەم دونیـایە رۆیی غـەوثی گـەیلانی**
**مەلایەك صەف بە صەف ئەمڕۆ لیباسی ماتەمی پۆشی**
**فوغانو زەلزەلـە وا کـەوتە ناو ئـەفواجی رۆحانی**
**قیامی ساعەتە ، یا زەلزەلەی نەفخەی فەزەع هەستا ؟**
**کە دەنگی ئاسـمان دێ دەم بـەدەم بۆ عالـەمی فانی**

نموونەی شیعری کوردی نەقێ شەریفی کۆیێ :

**وەها صاحیب سەلامو مەرحەبایە شاهی سیف الدین**
**دڵو جان پەڕە کایەو ، کەهرەبایە شاهی سیف الدین**
**ئەگەر مەطلەب خودا ناسینە یاران ! فرصەتە ئەمڕۆ**
**لە عەصری ئێمەدا قوطبی خودایە شاهی سیف الدین**
**حـەدیشـە : عالمانی واریشـی پێغـەمبـەرانی دیـن**
**بەلێ ! قایمەقامی ئـەنبیایـە شـاهی سیف الدین**

# لە ناوبردنی نەخوێندەواری، لە ناوبردنی هەژاری و نەزانین و نەخۆشیدایە

نموونـەی شـیعری کوردی مـەلا محـەمەدی شێخەڵمارێنی کـە نازناوی (عـەتیق)ە لە شـێوەنی شێخی (ضیائەددین)دا وتوویە :

**ئەی موریدان بێنە گریان هاتە روو هـەوری ئـەلەم**
**دەشتەو دەر تاریك بووە ئەمڕۆ لە ناو ظولماتو تەم**
**وا دەبارێنێ بە سەرمانا سیوولی دەردو غـەم خوێن**
**لەچاو جاری بووە فرمێسکی گریان بوو بـە چـەم**
**شاهی سەیفەددین کە رەختی بردە (جنات النعیم)**
**وەك (ضیائەددین) ستارەی صوبحی ئومێدی بـەیان**

ئەمەش ناوی ئەو شاعیرانەی کە لەو کەشکۆڵەدا تەنها شیعری فارسییان نووسراوە :

١ ــ باکی .
٢ ــ مەسروور : مامۆستا حەمەئەمینی دەلاکی بانـەیی .
٣ ــ مەولانا خالید .
٤ ــ ناری .
٥ ــ مەحموود بەگی برانکانی .
٦ ــ شێخ عەزیزی تەختەیی مولەققەب بـە (سلطان الشعراء) کە نازناوی (عەیشی) بووە شیعری تەنها لە وەصفی شێخی (ضیاءالدین)دا وتووە .

بێجگە لەمانەو بێجگە لەوانەیش کە نموونـەی شیعری کوردییانم نووسی ناوو بەرهـەمی (خاکی)و (مەولەوی)و (فەوزی) تێدایە . بەرهەمەکەی (خاکی) هەندێك لە پارچەی (بحرالنور)ە کە مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لێی کۆڵیوەتەوەو لە (گۆڤاری کۆڕی زانیـاری کورد)دا چاپ کراوە . بەرهەمـەکـەی (فەوزی)یش لە گەلاوێژدا چاپ کراوە .

# بارێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

تا چەند ساڵێکیش لەمەوبەر ناوناوە هەندێ ڕەخنەگر کەمێك لە سنووری شێوازی زانستانە دەردەچوونو لە هەڵسەنگاندنی بەرهەمدا توندوتیژ دەوەستان . بەڵام دوای ئەوەی ژمارەیەك وتارو ڕاوێژ دەربارەی چۆنیەتی ڕەخنەی ڕاستو زانستانە بڵاوکرانەوەو پاش ئەوەی خوێندەواری گەشەی کردو شارەزایی پتر پەرەیسەند ، ئیتر ئەو جۆرە ڕەخنانە وەختە بڵێم ناویان لە کووڵەکەی تەڕیشدا نەما . . . کەچی تازە بە تازە د . جەمال نەبەز لە وڵاتی ئەڵەمانیای فرە پێشکەوتووو مەڵبەندی شارستانییەتەوە لە ژێر پەردەی زانستداو بە ناوی ڕخنەوە وتەی پڕ لە بوختان و قسەی ناڕاست دەهۆنێتەوەو ئاراستەی زانایانی کوردو ئەندامانو فەرمانبەرانو دۆستانی کۆڕی زانیاری کوردی دەکا .

بەڵێ د . نەبەز لە نووسینەکانی زوویدا هەمیشە بەو شێوە ناڕاستە دوور لە زانستە هەڵسوکەوتی کردووە . یەکێك لەو نموونە دیارانەی کە لە بیر خوێندەوارانی کورد ناچێتەوە ، کتێبە بڕ جوێنەکەیەتی ، کە بە ناوی «کوردایەتی»یەوە دژی محەمەدی مەلا کەریم نووسی(١) . ناشیرینی و نارەوایی وتەکانی ئەو کتێبە بە ڕادەیەکە کە لە ناو بازاڕیشدا وێنەیان کەمەو من بەش بە حاڵی خۆم

شەرم دەکەم نموونەیان بخەمە پێش چاوی ڕووناکبیران . تەنانەت وا دیارە د . نەبەز خۆشی کەمێك شەرم گرتوویەتی ، بۆیە نەیویستووە ئەو کتێبە بە ناوی خۆیەوە بلاوبکاتەوەو ناوی (زەردەشت)ی لەسەر داناوە .

ڕەنگە خوێنگەرمیو هەرزەکاری بە شەرمەوە کەمێك پاکانە بۆ ئەو هەڵسوکەوتەی زووی د . نەبەز بکەن ، بەلام پاش چەند ساڵ خوێندنو ژیان لە ئەوروپا هیچ بەلگەیەك نی‌یە ڕووی بێ تکاکاری بۆ ئەوە بکا کە هێشتا هەر بەو شێوە ناشیرینەی جاران بنووسێ . بە وێنە جگە لەو کتێبو وتارو نامانەی ئەم ماوەیەی دوایی(٢) ، چەند مانگێك لەمەوبەر بە ناوی «سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتووو کۆڕی زانیاری کورد»ەوە لە گۆڤاری «کۆلێجی ئەدەبیاتی زانستگەی بەغدا»دا وتارێکی بلاوکردەوە(٣) ، کە پڕە لەهێرشی ناڕەواو وتەی سووکو ناشیرینو ڕێز نەگرتنی کاری خەلکی و شێواندنی ڕاستیو بوختانو خۆهەلکێشان . ئەوەی پتر سەرنج ڕابکێشێ ، ئەوەیە گۆڤاری ناوبراو ، کە گۆڤاری مەلبەندێکی بەرزی زانستە ، ئەو وتارەی بلاوکردۆتەوە. هەموو مرۆڤێکی دلسۆز سەرزەنشتی ئەو جۆرە کارانە دەکاو منیش لەم بارەیەوە تەنیا ئەوەندە دەلێم ، کە با لە پێناوی خۆپەرستی‌دا حورمەتی لێکۆلینەوەی زانستی نەشکێنین .

د . نەبەز کە لە وتاری ناوبراودا ڕەخنە لە (شێوەی پێکهاتنی کۆڕ)و (کارەکانی کۆڕ) دەگرێ ، هەموو سنوورێکی شکاندووە . بەڕاستی ئەگەر لەو کارەی د . نەبەز بێدەنگ بم ، لام وایە نە زانستو نە کوردایەتی لێم خۆش نابن . جا بۆیە وا بە پێی زانینو ئاگاداری‌ی خۆم بە کورتی وەلامی د . نەبەز دەدەمەوە .

لە ژێر سەرباسی «هەلەی زلە زلەی زلمانەوانی»دا نووسەر دربارەی فەرهەنگەکەی مامۆستا عەبدولڕەحمانی زەبیحی نووسیوێتی : «کۆڕی زانیاری لە ١٩٧٧دا فەرهەنگێکی بە نێوی (قامووسی زمانی کوردی)یەوە بۆ کاك ئەوڕەحمانی زەبیحی لە چاپدا . قەی‌ناکا کە کاك زەبیحی گەلێك وشەی کە کورد بەکاریان ناهێنێ بەسەر کورددا سەپاندوونی . با لەوەش بگەڕێین کە کاك زەبیحی لەژێر پەردەی ئەوەدا کە وشەی تازە داتاشراوی بە دل نی‌یە ، چووە گەلێك وشەی بێگانەی بەکارهێناوە کە بەرامبەرەکانیان لە کۆنەوە لە نێو زمانی کوردی‌دا هەن ، وەك : قاموس ، عامل ، لهجە ، فرق ، طبیعی ، فعل ، هنگامە ، سراسو ... هتد . کەچی چووە هێندی وشەی داتاشراوی کۆڕی بەکارهێناوە ... ئەمانە هەمووی قەی‌ناکاو بۆ ئەو . بەلام ئایا جێی داخو خەفەت نی‌یە لە فەرهەنگێکی وادا کە د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف کە لای خۆی دوکتۆرای لە (زانستی فەرهەنگ نووسینی کوردی)دا وەرگرتووەو بە ئاوو تاوەوە باسی فەرهەنگەکەی زەبیحی دەکا ، هەر لە لاپەڕەی یەکەمی‌یەوە لەسەر بنچینەی هەلە دامەزرابێ ؟ ... » (ل ٨٦ ــ ٨٧) . بەداخەوە ، ئەو چەند دێڕەی د . نەبەز لەبریتی ئەوەی هانم‌بدەن بۆ لێدوانێکی زانستانە ، بەرەو گێڕانەوەی هەلەق مەلەقم دەبەن ... دەگێڕنەوە پیاوێك بە هەلەداوان دەچێتە لای شێخ وەسمانو پێی دەلێ : میرزا مەحموود ، عەلی ئامۆزات کرا بە موتەصەریفی چوارتا ... شێخ وەسمانیش بە زەردەخەنەیەکەوە ڕوو دەکاتە پیاوەکەو دەلی : کاکە برا من میرزا نیمو شێخم ، ناوم مەحموود نی‌یەو وەسمانە ، ئەو کوڕەش کە تۆ دەلێی ئامۆزام نی‌یە ، پوورزامە ، ناویشی عەلی نی‌یەو فەتاحە ، بە خودای کراوەتە قایمقام نەك موتەصەریف ، ئەویش لە هەلەبجە نەك لە چوارتا ... هەر بەو چەشنە منیش ڕوو دەکەمە د . نەبەزو دەلێم :

١ ــ کۆڕی زانیاری کورد فەرهەنگی بۆ مامۆستا زەبیحی چاپ نەکردووە .

٢ ــ مامۆستا زەبیحی بۆ دەرمانیش زاراوەی کۆڕی ــ واتە ئەوەی تۆ ناوت ناون وشەی داتاشراو ــ بەکار نەهێناوە

٣ ــ من نەك هەر بە ئاوو تاوەوە ، بەلکو بە هیچ چەشنێك لەو فەرهەنگەدا باسی فەرهەنگەکەم نەکردووە .

بەلێ ساویلکەیی ئەو جۆرە هەلانە بە مرۆڤ دەکاو تەنانەت کەسانی زیرەکیش تووشی هەلە دەبن . بەلام جێگەی داخە کە زانایەکی وەك د . نەبەز ، نەك هەر هەلە بەلکو بوختانیش بە نووسەرانی کوردو دەزگا کوردی‌یەکان دەکا . بەو بۆنەیەوە کەمێك لەو سێ بوختانەی کە ڕاستی‌یان شێواندووە دەدەمە :

کاتێ خۆی مامۆستا زەبیحی داوای لە کۆڕ کرد فەرهەنگەکەی بۆ چاپ بکا ، بەڵام بەداخەوە لەبەر هەندێ هۆی نابەجێ کۆڕ بڕیاری لە چاپدانی نەداو ڕەتی‌کردەوە . بێ‌گومان بەلای هەموو دڵسۆزو شارەزایەکەوە ئەمە کارێکی ناڕەوابوو لە لایەن کۆڕەوە ... بەڵام لەو دەمەدا کە چاپخانەی کۆڕ فراوان کرابووو کاریش کەم‌بوو ، ئەنجومەنی کۆڕ بڕیاریدا بۆ ئاسان‌کردنی ئەرکی نووسەرانی کورد ، ئەگەر کتێبێکیان دەربارەی زمان یان ئەدەب یان مێژووو یان کولتوور ... ی کورد هەبێ بە پارە بۆیان چاپ‌بکا . جا مامۆستا زەبیحی لەسەرئەرکی خۆی ئەو فەرهەنگەی لە چاپخانەی کۆڕ لە چاپ‌داو ئەمەش هەر وەك ئەوە وایە کە لە هەر چاپخانەیەکی دی چاپ بکرایە . شایانی باسە مامۆستا زەبیحی زۆر مەردانە هەڵسوکەوتی کرد ، ئەویش ئەوە بوو کە بەرژەوەندی خودی وای لێ نەکرد دژی بەرژەوەندی میللەتەکەی بووەستێ .

لە ڕاستی‌دا ئەو بڕیارەی ئەنجومەنی کۆڕ بۆ پەسەندنەکردن‌و لە چاپ‌نەدانی فەرهەنگەکەی زەبیحی منی زۆر دڵگیر کرد و نەمتوانی هەڵوێستی خۆم نیشان نەدەم . بێ‌گومان هەڵوێستی ڕاستیش ، هەوڵی ڕاست کردنەوەی هەڵەیە ، نەك هەوڵی ڕووخاندن ... بەو بۆنەیەوە دەربارەی فەرهەنگی زەبیحی‌و بڕیاری کۆڕ ڕاپۆرتێکم بۆ ئەنجومەنی کۆڕ نووسی کە ئەوە دەقەکەیەتی :

ئەندامانی بەڕێزی ئەنجومەنی کۆڕ !

ماوەی چەند مانگێك لەمەوبەر فەرهەنگی کوردی – کوردی مامۆستا زەبیحی هاتە بەر دەستتان ، بەڵام بەداخەوە بڕیاری بۆ نەدرا لەسەر ئەرکی کۆڕ چاپ بکرێ . ئێستا نووسەرەکەی لەسەر ئەرکی خۆی خستوویەتیە ژێر چاپ . من لە ساڵی ١٩٧٣وە ئاشنایەتیم لەگەڵ ئەو فەرهەنگەدا هەبوو ئاگاداری هەموو ئەو قۆناغانەیم کە لەو دەمەوە پیایدا تێپەڕیوە . وشە بە وشەو دێڕ بە دێڕو لاپەڕە بە لاپەڕەیم بە وردی‌و بە چاوی موشتەری خوێندۆتەوە. چەند جار ڕاو تێبینی‌و سەرنجم لە بارەیەوە بۆ نووسەری دەربڕیوەو بە دڵی فراوانەوە بەشی هەرە زۆری بە گوێ کردووم ... گومانم لەوەدا نی‌یە کە بە نیسبەت کاری فەرهەنگ نووسی‌ی کوردی‌یەوە لە هیچ ڕوویەکەوەو بە هیچ جۆرێك فەرهەنگی وا سەرکەوتوو دانەنراوە ( ئەگەر پێویست بکا ، ئەوە ئامادەم بە بەڵگەی تەواو ئەو وتانەم بسەلمێنم ، یاخود لەگەڵتان گفتوگۆ بکەم ) و بە ڕاستی جێگەی شایان‌و شانازی‌یە کە کورد ببێتە خاوەنی ئەو جۆرە فەرهەنگانە . تەنانەت ئەو فەرهەنگەی کۆڕ کە من خەریکیم‌و هێشتا هەر خەوە ، مەگەر بەکارکردنی چەند کەسێکی شارەزاو کارامەو ئیشکەر بە ماوەی دە ساڵێك بتوانرێ لەوەی مامۆستا زەبیحی تێ‌بپەڕێنرێ . جا ئەو کارەی ڕەنجی هەموو ژیان‌و شارەزایی مامۆستا زەبیحی بێ‌و لە کوردی‌دا وێنەی نەبێ‌و بە ئاسانیش هەنگاوی لەو گەورەتر (بەتایبەتی بە خۆشمان) نەنرێ ، ئیتر بۆ دەبێ ئەوە چارەنووسی بێ ! .

بەداخەوە ئێرەدا نە شوێنی ئەوەیەو نە مەودای ئەوە هەیە لە هەموو ڕوویەکی ئەو فەرهەنگە بدوێم ، بەڵام ئەگەر کاتێ خۆی ئەنجومەن نووسەری ئەم چەند دێڕەی لەو مەسەلەیەدا بخوێنایەتەوەو وەك فەرهەنگ ناسێك لەو بارەیەوە پرسیاری لێ بکردمایە، هەڵبەت ئەوساکە بە دوورو درێژی ڕای خۆم دەردەبڕی ...

لێرەدا تەنیا ئەو ڕاستی‌یە دەخەمە پێش چاو ، کە کۆڕ بەرانبەر فەرهەنگی ناوبراو هەلێکی چاك‌و پڕ سوودو لەباری لە دەست داوە ... ئەگەر ئەنجومەن لەسەر لێکۆڵینەوەی تەواو ، چاوێك بەو باسەدا بگێڕێتەوەو بڕیارێکی واقیعی بدات ، ئەوە لەو ڕایەدام کە خزمەتێکی گەورە بە کوردو زمانی کوردی دەکاو ئەرکێکی گەورەی کۆڕیش بەجێ‌دێنێ .

لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزدا

ئەورەحمانی حاجی مارف

١٩٧٧/٤/١٢

ئەنجومەنی کۆڕ لە بڕیاری خۆی پەشیمان نەبووەوە ، بەڵام نە من بوومە دوژمنی کۆڕو نە کۆڕیش دوژمنی من . جا ئەمەیە ڕاستی‌و دروستی چاپ‌کردنی فەرهەنگی زەبیحی . بوختان‌و مەبەستی د . نەبەزیش لەهەموو کوردێکی دڵسۆز ئاشکرایە .

بوختانی دووەم ، ئەوەیە کە د . نەبەز دەڵێ : زەبیحی چووە«هێندێ وشەی داتاشراوی کۆڕی بەکارهێناوە» (ل٨٧) . مەبەستیشی لە وشەی

داتاشراو ئەو زاراوانەن کە کۆڕ داینـاون . لێرەدا وەڵامی ئەوە نادەمەوە کە زاراوەکانی کۆڕ داتاشراون یان نا ، چونکە دواتر لە شوێنێکی دیدا لێیان دەدوێم . بەڵام پەنجە بۆ ئەو ڕاستی‌یە ڕادەکێشم کە زەبیحی بۆ خوێی چێشتیش نەك زاراوی کۆڕ ، بەڵکو زاراوی هیچ دەزگاو کەسانێکی بەکارنەهێناوە . لەمەشدا چاکی کردووە ، چونکە زوربەی زۆری ئەو زاراوانە هێشتا نەچەسپاون ، جا مامۆستاش وتاری نەنووسیوە ، بەڵکو فەرهەنگی داناوە . ئەگەر چاوێك بە نووسینی کوردی‌دا بگێڕین ، دەبینین بەرانبەر (فعل)ی عەرەبی (کار ، کردار ، فرمان ...) بەکاردەهێنرێن‌و هەر کەسە یەکێکیانی بەلاوە پەسەندەو ناشترانرێ ڕێکە لە هیچ کەسێك بگیرێ‌و ئەمە قۆناغێکە لە ژیانی زانستی میللەتی کورد . جا زەبیحی کە فەرهەنگی نووسیوە ئایا ڕاستە لە فەرهەنگەکەیدا هەموو وشەکانی (کار ، کردار ، فرمان ...) بەرانبەر (فعل) دابنێ ؟ یاخود ڕاستە یەکێکیان هەڵبژێرێ‌و ئەوانی دی دوور بخاتەوە ؟ بێ‌گومان ئەگەر زەبیحی هەر ڕێکەیەکی لەو دوو ڕێکەیە بگرتایە ، ئەوە د . نەبەز خۆشی پێی ڕازی نەدەبوو . بەڵێ لەبەر ئەوەی هێشتا ئەو زاراوانە سلوان‌و کێشەو ڕای جیاوازیان لەسەر هەیە ، ڕاستتر وایە جارێ نەکەونە ناو فەرهەنگەوە ، چونکە زاراوەیەك کە لە فەرهەنگێکی گەورەی زماندا تۆمارکرا ، ئەوە وا دەگەیەنێ کە ئەو زاراوەیە چەسپاوەو جێگەی خۆی گرتووەو کێشەی لەسەر نەماوە ... زاراوەیەکی نارێك کە دەکەوێتە نووسینەوە ، لابردنی چەندە گرانە ، دەرهاویشتنی لە فەرهەنگ صەد هێندە ئەرکی پتر پێ دەوێ ... لە هەندێ شوێنی نووسینی د . نەبەزدا ئەوە بەدیاردەکەوێ کە ئەو زاراوانەی خۆی دایناون یاخود ئەوانەی خۆی بەکاریان دەهێنێ‌و پەسەندیان دەکا ، بە چەسپاویان دادەنێ . بێ‌گومان ، ئەم خەیاڵەی د . نەبەز لە ڕاستی‌یەوە دوورە .

سەرەڕای ئەو دوو بوختانە ، ئنجا بە زمانێکی بازاڕیانە ، وەك هەموو خەڵك چاوەڕوانی خێری ئەوبن ، ڕوو دەکاتە زەبیحی‌و دەڵی : «ئەمانە هەمووی قەیناکاو بۆ ئەو» (ل۸۷) ... بەدوای ئەو وشانەدا کەمێك واز لە زەبیحی دێنێ‌و بەرۆکی من دەگرێ‌و بوختانی سێیەمی دەهۆنێتەوەو دەڵێ : «بەڵام ئایا جێی داخ‌و خەفەت نی‌یە لە فەرهەنگێکی وادا کە د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف کە لای خۆی دوکتۆرای لە (زانستی فەرهەنگ نووسینی کوردی)دا وەرگرتووەو بە ناوو تاوەوە باسی فەرهەنگەکەی زەبیحی دەکا ، هەر لە لاپەڕەی یەکەمی‌یەوە لەسەر بنچینەی هەڵە دامەزرابێ ؟ » (ل ۸۷) .

ئەوەی بە کەم‌و کورتی‌یەکی گەورەی خۆمی بزانم‌و یەکێك بێ لەو ئەرکانەی هێشتا بەجێم نەهێناون ، ئەوەیە کە تا ئێستا بە نووسین بەرانبەر فەرهەنگەکەی زەبیحی ڕای خۆم دەرنەبڕیوە(٤) . جا من کە نەك لە فەرهەنگی ناوبراودا ، بەڵکو لە شوێنی دیش دەربارەی نەدوابم ، ئیتر د . نەبەز چۆن ئەو بوختانە بە دەممەوە دەکا . ئەگەر د . نەبەز ڕاستی دەکرد ، خۆ دەبوو بنووسی لە چ لاپەڕەیەکدا باسم کردووە ، یاخود دەبوو چەند وشەیەك لەو وتارەم بێنێتەوە و ئەگەر لە شوێنێکدا بە هەڵە چووبم وەڵامم بداتەوە ... بێ‌گومان ، د . نەبەز ئەمانەی نەکردووە ، چونکە وتار لە ئارادا نی‌یە. تا ئێستە کەسێکی دیم نەبینیوە کە وا بە قەڵەمی بوختان ئەو جۆرە ناڕەوایی‌یە لەگەڵ زانستدا بکا ... کەی‌و لە کوێ ڕووی‌داوە بەو چەشنە حورمەتی لێکۆڵینەوەی زانستی بشکێنرێ ؟ ... دیارە مەبەستی د . نەبەز لەو بوختانە ئەوەیە ، پێشەکی پێم ڕابگەیەنێ کە ئەو فەرهەنگە پەسەند نەکەم . بێ‌گومان ، ئەگەر بەڵگەو ڕەخنەو سەرنجی ڕاست‌و دروستی بۆ ڕەتکردنەوەی هەبوایە ، ئەوە کاری تێدەکردم ، بەڵام قسەی پووت‌و بەتایبەتی ڕەق‌و ناشیرین کار ناکەنە سەر قەڵەمی من‌و ڕێی ڕاستم پێناگۆڕن ...

سەرەڕای ئەو سێ بوختانە ، ڕەخنەیەکی لاوازو هەڵەیەکی گەورەو بێ‌ویژدانی‌و وشەی سووك‌و ناشیرین لە باسی فەرهەنگەکەی زەبیحی‌دا ئاشکراو زەق لەبەرچاون

ڕەخنە لاوازەکەی ئەوەیە کە دەڵێ : «چووە گەلێك وشەی بێگانەی بەکارهێناوە کە بەرامبەرەکانیان لە کۆنەوە لە نێو زمانی کوردی‌دا هەن ...» (ل ۸۷) بەڵێ لە فەرهەنگی زەبیحی‌دا گەلێ وشە هەن ، کە بەڕەسەن بێگانەن ، بەڵام زوربەی ئەو وشانە لە کوردی‌دا بنجیان داکوتاوە و خەڵکی گوندو شار بەکاریان دێنن ، لە بەرهەمی

شاعیرانو ئەدیبانی کورددا دەبینرێن ... جا ئیتر هەر لەبەر ئەودی بەڕەسەن کوردی نین ، دەبێ لەو فەرهەنگەدا تۆمار نەکرین ؟ بەتایبەتی کە فەرهەنگەکە فەرهەنگی زمانی کوردی‌یە ، نەك فەرهەنگی وشەی کوردی . بۆ دەبێ وشەی بێگانەمان بەلاوە هێندە ناحەز بێ ؟. دیارە د . نەبەز دەیەوێ هەموو شتێکمان لە میللەتانی سەر ڕووی ئەم زەمینە جیا بێ . ئەگینا وە نەبێ فەرهەنگەکانی زمانی ئینگلیزیو ڕووسیو ئەلەمانی ... وشەی بێگانەیان کەم تێدانەبێ . بە وێنە لە لاپەڕە (٣)ی «فەرهەنگی زمانی ڕووسی»دا(٥) ، (٣٦) وشە تۆمارکراون ، کە (٣٣)یان بێگانەن . جا پێویستە ئەوە لە یاد نەکەین ، کە لەسەر ڕووی زەمیندا هیچ زمانێك نی‌یە کە زمانی بێگانە کاری تێ نەکردبێ ، یاخود تەئسیری زمانی بێگانەی لەسەر نەبێت . هەروەها هیچ میللەتێك یاخود هەلگری هیچ زمانێك بە ڕەهایی‌و بە شێوەیەکی تایبەتی‌و جیاوازو دوور لە میللەتان ناژی.

خاسیەتی کۆمەلایەتی‌ی وتووێژی مرۆڤو ڕووداوی مێژوویی ، کە پێشکەوتنی کۆمەل دیاری دەکەن ، ددبنە هۆی ئەوەی کاری‌تێ‌کردنی زمانێك بە سەر زمانێکی ترەوە ببێتو زمانێك لە زمانێکی ترەوە شت وەربگرێ . ئەم دیاردەیەش پتر لە موفرداتی زماندا دەردەکەوێ .

لە ئەنجامی پەیوەندی دوورو درێژی ئابووری‌و سیاسی‌و جەنگی‌و کولتووری ... میللەتی کورد لەگەل میللەتانی تردا ، گەلێك وشەو پارچەی وشە هاتوونەتە زمانی کوردی‌یەوەو لە دەستووریشیدا بنجی خۆیان داکوتاوە .

ئەم دیاردەیە ــ واتە کاری زمانی بێگانەو وەرگرتنی وشەی بێگانە ــ وە نەبێ شتێکی خراپو زیان بەخش بێ ، بەلکو بە پێچەوانەوە زمانی ئێمەیان دەولەمەندو فراوانو بەرین کردووە . بێ‌گومان ، ئەوەی کورد لە بێگانەی وەرگرتووە خستوویەتیە ژێر باری فۆنەتیكو وشەڕۆنانو دەستوورو ڕێزمانی کوردی‌یەوە و بەمە بەرگێکی کوردانەی بەبەردا کردووە .

لەگەل هەموو ئەوەشدا ، بێ‌گومان پێویست ناکا بەبێ هۆ وشەی بێگانە بەکاربهێنرێ ــ واتە کاتێك بۆ دەربڕینی مەبەستێك وشەی ڕەسەنو جوانو لەبارو بەکارهێنراوو ئاشکرای کوردی هەبێت ، ئیتر بۆ پەنا بۆ وشەی بێگانە ببرێت ــ بوچی بلێین «دەماغ ، فەقەرە ...» لە کاتێکدا کە خۆمان «مێشك ، بڕبڕە ...» مان هەیەو چی‌یان لە «دەماغو فەقەرە ...» کەمتر نی‌یە . جگە لەوە پێویستە ئەوەش لە یاد نەکەین کە بەکارهێنانی وشەی بێگانە ، بەتایبەتی لە شوێنی پێویستی خۆیدا کارێکی ڕاستو ڕەوانە و هەر وەك وشەی کوردی ڕەسەن جێی خۆی دەگرێ .

منیش لەو ڕایەدام کە مامۆستا زەبیحی هەندێ وشەی بێگانەی ئەوتۆی لە فەرهەنگەکەیدا تۆمارکردووە کە نەدەبوو بکەونە ناوەوە ، بەلام نەك بەو شێوەیەی د . نەبەز دەلێ (گەلێك) .

لە باسی نەبوونی (هەمزە) لە کوردی‌دا تووشی ئەو هەلە گەورەیە بووە ، کە (فۆنێم)و (دەنگ)و (پیت)ی تێکەل کردووە. نەزانینو لێك جیانەکردنەوەی ئەو سێ مەفهوومە کە سەرەتایەکی ئەلفوبێی زمانەوانی‌یە ، نەك هەر لەم شوێنەدا ، بەلکو لە سەرپاکی وتارەکەو تێکڕای نووسینەکانی تری د . نەبەزدا زۆر ڕوونو ئاشکرا دیارە . جا لەبەر ئەوەی ئەم هەست نەکردنەی د . نەبەز پەیوەندی بە گەلێ شوێنی ترەوە هەیە ، بۆیەکا ئێستا کەمێك لە باسە سەرەکی‌یەکە دوور دەکەومەوە و بە کورتی لەوە دەدوێم ، کە چۆن د . نەبەز تا ئێستاش سێ مەفهوومی (فۆنێم)و (دەنگ)و (پیت) لێکجیا ناکاتەوە .

د . نەبەز لە زوربەی زۆری نووسینەکانیدا (دەنگ)ی بە (پیت ــ کە ئەو تیپی پێ دەلێ) ناو بردووە . ئەم هەلەیەی لە سەرپاکی وتاری «سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتووی کۆڕی زانیاری کورد»و کتێبی «زمانی یەکگرتووی کوردی»دا کوتاوەتەوە . بێ‌گومان جێگەی ڕەخنەیە د . نەبەز لەو سەرەتایەی زمانەوانی بێ ئاگایەو مەفهوومی (دەنگ)و (پیت)ی وا تێکەل کردووەو لە یەکتری جودا نەکردوونەتەوە .

وەك ئاشکرایە (دەنگ) لە ڕێگای ئەندامەکانی ئاخاوتنەوە دەردەبڕێتو بە هۆی بیستنەوە هەستی پێ‌دەکرێ . (پیت) وێنەی دەنگەکە بە نیشانە لە نووسیندا دیارکراوەو بە هۆی بینینەوە وەردەگیرێ . ڕاستە مرۆڤ نەك تەنها دەتوانێ وشە بە دەمدا بێنێ، بەلکو هەروەها دەتوانێ بیشینووسێ ، یاخود چاپی

بکات . بەڵام کاتێ ئێمە دەنووسین یاخود چاپ دەکەین ، ئەوە وێنەی دەنگەکانی ئاخاوتن بە پیت نیشان دەدەین . بەڵێ زمان دوو دیوی هەیە : ئاخاوتن‌و نووسین . بەڵام ئاخاوتن ڕەسەنترەو پێش نووسین کەوتووە . منداڵ لە سەرەتادا فێری قسە کردن دەبێ‌و دوایی نووسین . زۆر کەسانیش هەن سەد ساڵ دەژین‌و ڕەوان‌و پاراو بە زمانەکەیان دەدوێن بێ‌ئەوەی فێری خوێندنەوە یان نووسینی پیتێك بووبن . لەم سەدەی بیستەمەشدا هێشتا میلەتی ئەوتۆ هەیە کە لەو دەستکەوتە مەزنەی شارستانی‌یەت بێ بەشە .

جا جێگەی ڕەخنەیە کە د . نەبەز لەم سەرەتا زمانەوانی‌یە بێ ئاگایەو بەڵگەشم بۆ سەلماندنی ئەم وتانەم ، ئەوەیە کە کەرەستەی ئاخاوتنی تێکەڵ بە کەرەستەی نووسین کردووە ــ واتە دەنگەکانی ئاخاوتن کە لە زارەوە دەردێن لەگەڵ کەرەستەی نووسین بە یەك شت تێگەیشتووە :

بە وێنە لە لاپەڕە (٦٥)ی کتێبی «زمانی یەکگرتووی کوردی»دا ، لە یەکەم دێڕی ژێر سەرباسی «دەنگی (ك)و (گ) ...» دا ، دەڵێ : «کاتێك تیپی بێ دەنگی (ك)و (گ) لە وشەیەکدا پێش هێندێ تیپی دەنگدار بکەوێ ، بە تایبەتی (ئی ــ î)و (ئێ ــ ê)و (ئوێ ــ Ö) ئەو کاتە دەنگەکانیان نەختێك نازك دەبێتەوە» . لە سەرباسدا دیارە کە دیەوێ لە (دەنگ) بدوێ ، کەچی لە یەکەم دێڕی باسەکەدا دوو جار (تیپ)ی لە جێی (دەنگ) بەکارهێناوە . دوای ئەو هەڵەیە ئنجا لە دێڕی دووەمدا (ك)و (گ) بە (ددنگ)ناو دەبا . لێرەدا سەرنج ڕاکێش ئەوەشە کە (ی ، ێ ، وێ)ی بە (ئی ، ئێ ، ئوێ) ناوبردووە ، واتە بە ناوی پیتەکانەوە ، دەنگەکانی ناو ناوە .

لە لاپەڕە (١١٤)ی وتاری «سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتووو کۆڕی زانیاری کورد»دا ، نووسیوێتی : «ئەمجا دەمێنێتەوە سەر دەنگی ( a ) لە بازاڕداو دەنگی ( ê ) لە وشەی بازێڕدا (واتا : ئا و ئێ) بە پێی دەستووری زمانەوانی بە زۆری لە وشەی فارسی‌ی تازەدا تیپە دەنگداری درێژ ( a ) کە پاش تیپێکی بێ‌دەنگ بێ ...» . لە سەرەتای ئەو چەند دێڕەدا ئاشکرا دیارە کە مەبەست لێکۆڵینەوەی دوو دەنگی (ا ــ a) و (ێ ــ e) یە و د . نەبەز ڕاست دەستی به باسەگەی کردووە ، کەچی دواتر بەپیت (نووسەر وتەنی تیپ) ناوی بردوون . لەم باسەدا مەبەست گۆڕانی دەنگە بە دەنگێکی تر ، کە دیاردەیەکی فۆنەتیکی زمانە . هەرچی (پیت)ە لێرەدا هیچ پەیوەندی‌یەکی بەو کێشەیەوە نی‌یە ... هەر لەم شوێنەدا هەڵەیەکی دی سەرنج ڕاکێش ، ئەوەیە کە بۆ دەنگی کۆنسۆنانت ( Consonants ) زاراوەی (تیپی بێ‌دەنگ)ی بەکارهێناوە . هەرچەندە لە بریتی (تیپ) دەبوو (دەنگ) بەکاربهێنێ ، بەڵام لێردا مەبەستم تەنیا هەڵەی جیا نەکردنەوەی (پیت)و (دەنگ)ەکە نی‌یە ، بەڵکو مەبەستم نالەباری‌و نەگونجانی زاراوەی ( بێ‌دەنگ )ە ، کە بەرانبەر ( کۆنسۆنانت ــ Consonants ) بەکاری هێناوە . وەك ئاشکرایە ، هەموو ددنگێك ، ددنگی هەیە . جا با ئەو دەنگە بەرز بێ یان نزم ، کۆنسۆنانت بێ یان بزوێن . بەڵام کە وترا (بێ‌دەنگ) ئەوە وا دەگەیەنێ کە ددنگی نی‌یە . جا کە (د ، ت ، ز ، س ، ژ ، ش ، ڤ ، ف ...و تێکڕای دەنگە کۆنسۆنانتەکانی دی دەنگ‌بن‌و بەدەمدا بێن ، ئیتر چۆن دەکرێ بوترێ (بێ‌دەنگ)ن . خۆ د . نەبەز بە دەگمەن زاراوەیەك پەسەند دەکا کە خۆی دای‌نەنابێ ، کەچی وا بە ساکاری زاراوەی (بێ‌دەنگ)ی وەرگرتووە .

تا ئێرە ئەوەم ئاشکرا کرد کە د . نەبەز تاکو ئێستا جیاوازی لە نێوان (پیت)و (دەنگ)دا ناکات . ئنجا با بێینە سەر بەراوردکردنی (ددنگ)و (فۆنێم) کە هەڵەی گەورەی د . نەبەزی تێدا دەردەکەوێ . وەك ئاشکرایە ، فۆنێم بەو دەنگانە دەوترێ کە لە زماندا وشە پێكدەهێنن‌و بە گۆڕان‌و لاچوونیان واتا دەگۆڕێن . بۆ نموونە ، ئەگەر فۆنێمی (ا) لە وشەی «باز»دا بگۆڕێت بە (ە ، ۆ ، ێ ...)، ئەوە ئەم وشانە «بەز ، بۆز ، بێز ...» پەیدا دەبن ، کە جیاوازی‌یەکی تەواو لە مانایاندا هەیە ــ واتە لێرەدا فۆنێمی (ە ، ۆ ، ێ ...) دەوری گۆڕینی مانای وشەی «باز» دەبینن . ئەگەر فۆنێمی (ز)یش لە وشەی «ناز»دا بگۆڕێت بە (ن ، ڵ ، ڤ ، خ ...) ، ئەوە ئەم وشانە : «نان ، ناڵ ، ناڤ ، ناخ ...» دروست ددبن ، کە هەر یەکەیان مانای تایبەتی خۆی هەیە ــ واتە بەم جۆرە دەبینین کە وا فۆنێمی (ن ، ڵ، ڤ ، خ ...) مانای وشەی «ناز» دەگۆڕن ...

لێرەدا پێویستە ئەوەش لەیاد نەکەین ، کە هەرچەندە فۆنێم کاری جیاکردنەوەی گۆڕینی مانا بەجێ دەهێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە تەنیا خۆی خاوەنی ماناو واتا نی یە .

(فۆنێم) لە (دەنگ) گرنگترە ، چونکە جیاوازی دەخاتە نێوان وشـەوە . هەموو فۆنێمێك ، دەنگە ، بەڵام هەموو دەنگێك ، فۆنێم نی یە . بە وێنە : (قیژە ، هاوار ، قۆڕەی سك ، قرتێنە ، نزگـەرە ، پرخەپرخ، کۆکـە ...) هـەموو دەنگـن ، بـەڵام هیچیـان فۆنێم نین . یاخود کاتێ (گ ، ك) لە پێش (ی ، ێ ، وێ ، وی)دا دەگوترێن ، شێوەی تـەلەفوزیان وەك (چ) یان (ج)ی لێ دێت ــ واتە (گ) و (ك) لە حالەتی ئاسایی‌دا لەبنی ئەوکەوە تەلەفز دەکرێن ، بەڵام لە حالەتی دووەمدا زمان نزیك مەڵاشوو دەخاتـەوە . بەوپێ‌یە دەبنە دەنگی جیاواز ، بـەڵام نابنـە فۆنێمی جیاواز .

لە نووسینە زمانەوانی‌یـەکانی د . نەبـەزدا وشەی (فۆنێم) بەرچاو ناکەوێ‌و نـەك هـەر وا تێ‌گەیشتووە کە دانـەی گرنگـی زمان دەبێ (دەنگ) بێ ، بەڵکو لەگەڵ (پیت)یشدا تێکەڵی کردووە . جا ئەو جیانەکردنەوەیە تووشی ئەو هەڵەیـەی کردووە کە (هەمزە) بە دەنگ دانەنێ‌و ڕەخنە لـە مامۆستا زەبیحی بگرێ ، کـە چۆن فەرهەنگەکـەی بـە پیتی هەمزە دەست‌پێ‌کردووە .

هەرچەندە مـن لەو ڕایـەدام کـە لـە زمانی کوردی‌دا هەمزە (فۆنێم) نی‌یە ، بەڵام وەك (دەنگ)ێك بۆ یاریدەی دەربڕینی بزوێنەکان ، بەتایبـەتی لـە سـەرەتای وشەوە دێت . جا بەو پێ‌یە لەو ئەلفوبێ کوردی‌یەی لە ئـەلفوبێی عـەرەبی ــ فارسـی دەسـتکاری کراوەوە وەرگیراوە ، وێنـە بۆ دەنگی (هەمزە) دانراوە . جا لەبەر ئەوە مامۆستا زەبیحـی ئەگەر نەك هەر بە (فۆنێم) ، بەڵکو بە (دەنگ)یشـی دانەنایە ، ئـەوە هەر ناچار دەبوو لـە ڕێکخستنی فەرهەنگەکـەیدا وەك (پیت)ێك حیسـابی بۆ بکا ، چونکە وەك ئاشکرایە ، لەو ئەلفوبێ‌یەی ئێستا ئێمە پێی دەنووسین ، هەمزە بە یـەکـەم پیتی ئـەلفوبێ دانراوە ، ئەمەش لە فەرهەنگە کوردی‌یـەکان (٦) و نووسین‌دا تـەواو ڕەچاو کراوە و بۆ پتر سـەلماندنی ئەو ڕایەم ، هەر لەو لاپەڕەیەدا کە د . نەبەز لـەو بارەیەوە ڕەخنەی لە زەبیحی گرتووە ، چەندین وشە دەبینرێن کە بە پیتی هەمزە دەست‌پێ‌کراون‌و نیگارو وێنەیان کێشراوە ، وەك : (ئەو ، ئـەلف ، ئەمانـە ، ئامراز ...) . ئایا هێشـتا کـەس لـەو ئیملا ستاندارتەدا ئەوەی بینیوە کە ئەو وشانە بەم جۆرە (ەو ، ەلف ، ەمانـە ، امراز ...) بنووسـرێن ؟ نەخێر ! چونکە وا ڕۆیشتووە . ڕاستە لە ئەلفوبێی لاتینی‌دا هەمزە وێنەی بۆ دانەنراوە ، بـەڵام ئەمـە هیچ کارێکی لەو ئـەلفوبێ عـەرەبی ــ فارسـی‌یـە دەستکاری‌کراو و وەرگیراوە ، نەکردووەو هیچی لێ نەگۆڕیوە . لەبەر ئەوە ئەگەر زەبیحی وەك هـەموو ئەو خەڵکە هەمزەی بە یەکەم پیتی ئـەو ئەلفوبێ‌یـە دانابێ ، دەبێ گوناهی چی بێ ؟ ... خۆ ئەگەر د . نەبەز نووسینی هەمزە بەلایەوە ڕاست نی‌یە ، ئەوە با بە وتارێکی زانستی ڕەتی‌کاتەوە .

بەو پێ‌یە دەرکەوت کە هەڵە گەورەکـەی د . نەبەز لەوەدایە کە هەمزە بە دەنگ دانانێ . بێ‌گومان، وا نی‌یەو هەمزە دەنگەو لەو ئەلفوبێ‌یەی ئێستە پێی دەنووسـین وێنـەی (ئ)ی بۆ دانراوە . دانـەنانی هەمزە بە دەنگ ڕاست نی‌یە ، چوونکـە تـەلەفووز دەکرێ‌و دەبیسترێ ، بەڵام دانەنانی بە فۆنێم شتێکی ڕاستـە ، چونکە دەوری واتا گۆڕی و وشەپێکهێنـان نابینێ . وەك وتیشم ، هەموو دەنگێك فۆنێم نی‌یە ، بەڵام هەموو فۆنێمێك دەنگە .

جا د . نەبەز کە خۆی بە پسپۆڕی زمانەوانی دادەنێ‌و هەردەم باسی شارەزایی و فراوانی زانینی خۆی دەکا ، کەچی ئەو سەرەتا ئاسانـەی زانسـتی زمان نازانێ ، هێشتا بە خۆشیدا ڕادەپەرموێ تونلو تیژ هێرش بباتە سەر خەڵکی‌و بە ئووت بەرزی‌یەوە پێ‌یان بڵێ : «کە ئەمانە لە زانستی زمانەوانی‌دا بـە کفر دەژمێررێن‌و هەرچی ئەلفوبێی زمانەوانی بزانێ نابێ بکەوێتە هەڵەی لەم جۆرە» (ل ٨٨) .

ئەو چەند بوختان‌و هەڵانەی تا ئـەم شوێنـە لێیان دوام لە لایەك ، بەڵام ئێستا سەرنجی خوێنەر بۆ بێ ویژدانی‌یـەکی د . نـەبەز ڕادەکێشـم ، کـە خوێنـەر هەزار خۆزگـە بۆ بوختـان‌و هـەڵەکانی بخوازێ . ئەویش ئەوەیە کە فەرهەنگی زەبیحی بـە یەکجاری ڕەت‌دەکاتەوەو دەڵێ : هەر لـە لاپـەڕەی یەکەمی‌یەوە لەسـەر بنچینـەی هەڵـە دامەزراوە (ل ٨٧) .

سەیر ئەوەیە ، کە هەموو بەڵگەی ڕەت‌کردنەوەی

ئەو فەرهەنگەش ئەو دوو سەرنجەن کە خۆی تیایاندا بە هەڵە چووە . ئەگەر د . نەبەز ڕەخنەی زانستیو بنەڕەتیشی بەرانبەر ئەو هەموو زانیارییەی مامۆستا زەبیحی لەو پێشەکییە دوورو درێژەی فەرهەنگەکەیدا تۆماری کردووە ، هەبوایە ، یاخود نیشانیشی بدایە کە زەبیحی لە دیاری کردنی ڕەسەنی وشەکاندا هەڵەی زۆری کردوە ، یاخود ئەوەشی بخستایەتە پێش چاو کە واتای گەلێك وشەی ڕاست یان باش لێك نەداوەتەوە ، یاخود نموونەی لەبارو گونجاوی نەهێناوەتەوە ... ئەوە هێشتا نەدەبوو ئەوەی وتوویەتی بیڵێ ، چونکە نەك ئەو بەرهەمە شاکاردی زەبیحی بەڵکو هیچ بەرهەمێك سەرلەبەری خراپ نییە . هەر بەو شێوەیەش کاری وەها نییە بێکەم و کورتی بێ ... ئەم جۆرە حوکمە ناڕەوا دوور لە زانستییەی د . نەبەز نەك هەر لێرەدا ، بەڵکو لە گەلێ شوێنی تری وتارەکەیدا دەبینرێ . بە وێنە لە پەراوێزی ژمارە (٢٠)دا کاتێ دەیەوێ گلەیی لە کۆڕی زانیاری کورد بکا ، لەسەر ئەوەی لەو وتارەیدا کە بەناوی «کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەڵمانیادا»وە لە بەشی یەکەمی بەرگی دووەمی گۆڤاری کۆڕدا بۆی بڵاوکراوەتەوە ، گوایا لە وشە ئەڵمانییەکاندا هەڵەی چاپ ڕوویداوە . جا بەو بۆنەیەوە د . نەبەز نووسیویەتی ، دەڵێ : «هەموو وشە ئەڵمانییەکانی بە هەڵە لە چاپدا» (ل ١١١) . زمانەوانێکی وەك د . نەبەز نەدەبوو بۆ ئەو مەبەستە وشەی «هەموو» بەکاربهێنێ ، چونکە ئاشکرایە کە «هەموو» واتایەکی مطلق دەدات . جا بەو پێیە دەبێ وشەی ڕاستی تێدا نەبووبێ . بێگومان ، ئەمەش هەر وەك جوکمەکانی تری ناڕەوایە . بەڵام سەیرو سەمەرە ئەوەیە کە دەربارەی هەمان باس لە وتارێکی زووتریدا دەڵێ : «وشە ئەڵمانییەکانی نێو وتارەکە بە زۆری بە هەڵە و ناتەواوی چاپکراون»(٧) . پێویست بەوە ناکات ئەو دوو ڕستەیەی د . نەبەز کە لە دوو وتاری جیاوازدا بەکاریهێناون بەراوردبکەم ، هیوام وایە خۆی بە سەریاندا بچێتەوە... لێرەدا تەنیا ئەو ڕاستییە دەڵێم کە د . نەبەز ئەودەم کە هێشتا ڕقی لە کۆڕ هەڵنەستابوو ، یاخود هێشتا بە دەنگو باسی ناڕاستو بوختانی هێندێ کەس گەرم نەبووبوو ، دەیوت بە زۆری...»، کەچی ئێستا ڕقو کینە وای لێکردووە ڕاستی تێدا نەبینێ . بەڵێ ئەنگە زانایەك بە داخی دڵی خۆی زانست بەو دەردە بەرێو بە ئارەزووی خۆی حوکم بدا .(٨)

جا بەم جۆرە بێ ویژدانی د . نەبەز لە ڕەت کردنەوەی گەلێ شتدا دەبینرێو لە نێوانیاندا فەرهەنگی زەبیحیشی بەرکەوتووە .

هەموو ئەوەی تا ئێرە لێی دوام لە لایەکو شێوازی بازاڕیو قسەی سووك بەکارهێنانی لە لایەك . بە وێنە لە باسی (هەمزە)دا ڕوو دەکاتە زەبیحیو دەڵی : «هەمزە لە هەباسی چی» (ل ٨٧) . دواتر وتەی ناشیرینی خەستتر دەکاتەوەو دەڵێ : «... زەبیحی کە هەرچەندە مرۆڤێکی <u>زۆرزانە</u>» (ل ٨٨) . بە ڕاستی مەگەر هەر د . نەبەز وا بە چاوی سووك تەماشای ئەو کەسانە بکا کە خزمەتی زمانی کوردی دەکەن ... نووسەری وتار بەو وتانە هێشتا دڵی ئاوی نەخواردۆتەوە و ڕوو دەکاتە کۆڕی زانیاری کوردو دەڵێ : ئەگەر زەبیحی زۆرزان «ئەمەی لێتێکچوو ، ئەی چۆن دەبێ کۆڕێکی زانیاری زلو زەلام شتێکی وای لێ تێك بچێ !» (ل ٨٨) . وەك ڕوونمکردەوە د . نەبەز ڕاست ناکاو کۆڕ فەرهەنگی بۆ مامۆستا زەبیحی چاپنەکردووەو مامۆستا زەبیحیش (هەمزە)ی لێتێك نەچووە . خۆ ئەگەر زەبیحی هەڵەشی کردبێ ، ئەوە کابرایەکە لە هیچ زانستگەیەکی وڵاتو هەندەران نەی خوێندووەو هێندەی لێ دەزانێ . هەرچی کۆڕیشە ، وەك هەموو دەزگایەکی دی کوردی هەر ئەوەندەی لە باردایە . بەڵام ئەی یەکێك : مامۆستای ئێتیمۆلۆژیای گەلانی ئێران ، هەروەها زمانو کولتوری کورد لە زانستگەی بەرلین و ئەندامی کۆڕی لێکۆڵینەوەی زانستانە لە ئەڵەمانیای ڕۆژئاوا بێ(٩) ، چۆن بەو شێوەیە بوختان دەکاو بەو ڕادەیە بێ ویژدان دەبێو هێندە وشەی سووكو ناشیرین بە زانایانی کورد دەڵێو هیچ ڕێزی ڕەنجو بەرهەمیان ناگرێو لای وایە کەس هیچ نازانێو کەچی خۆشی لە گەلێك سەرەتای ئەلفوبێی زمانەوانی بێئاگایە ... یاخود چۆن لە چوار دیواری مەڵبەندێکی فرە گەورەو پێشکەوتووی وەك «زانستگەی ئازاد لە بەرلین»دا ئەو چەشنە بەرهەمانە دێنە ئەنجام . نەخێر من وەك د . نەبەز ، خۆمو خەڵك تەفرە نادەمو دەزانم کە «زانستگەی

ئازاد لە بەرلین» ئاگاداری ئەو کـەین‌و بـەینەو ئـەو هەڵاو بگرەی د . نەبەز نی‌یە .

– ماوێتی –

**پەراوێزەکان**

١ ــ زەردەشت ، کوردایەتی بزووتنەوەو برواو رژێمە ، ١٩٦٠ .

٢ ــ لە هەموو نووسراوەکانی دی ئەم دوایی‌یەدا هەر ئەوە شێوەی نووسینی د . نەبەزە ، بە وێنە :

ا ــ لە کتێبی «زمانی یەکگرتووی کوردی»دا ، کە سالی ١٩٧٦ لە بامبێرگ بلاوی‌کردۆتەوە ، هـەر هێرش‌و وتەی ناشیرین‌و رێزنـــەگرتنی بـەرهـەمی خەڵك‌و خۆ هەڵکێشانە .

ب ــ وتاری «رەخنەی زمانـــەوانی‌و لیـــی کوێرانە هاویشتن» ، کـــە لە ژمارە (٩)ی ســـالی ١٩٧٨ی گۆڤاری «ئاســـۆی زانکۆیی»دا چاپ‌کراوە ، تەنیا ناوی وتارەکە بەسە بۆ بـەڵگـەی ئـەو جۆرە هەڵس‌وکەوتە .

ج ــ نامەیەکی بۆ جێگری پێشووی سەرۆکی کۆڕ ــ مامۆستا مەسعوود محەمەد ناردووە ، مەگەر هەر د . نەبەز رووی بێ ، ئەو وشانە بخاتە ســەر کاغەز . خوا هەڵناگرێ برادەرەکانیشی لەمەشـــدا درێغی‌یان نەکردووە و وێنـەی ئـەو نامەیـەیان بۆ گرتۆتەوە و بەسەر رووناکبیراندا بلاویان کردۆتەوە .

... و هەندێکی تر .

٣ ــ د . جەمال نەبەز ، سـەرنجێك لە چەنـد زاراوەیەکی تازە بەکارهاتووو کۆڕی زانیـاری کورد ، «گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات» ، بـــەغدا ، ١٩٧٨ ، ژ ٢٢ ، ل٧٩ ــ ١١٥ .

٤ ــ تەنیا لەو وتارەدا کە دەربارەی فەرهەنگی ئەستێرەگەشە لە ژمارە (٢٤٨)ی ســالی (١٩٧٧)ی

## داگرتنی ووزە مرۆڤانەی گەلەکەمان بارمتەیەکە بۆ لەناوبردنی نەخوێندەواری

رۆژنامەی «بیری نوێ»دا بلاوم‌کردۆتەوە ، بـە دوو دێرێك هەواڵی دەرچوونی فەرهەنگەکەی زەبیحیـم بە خوێنەران راگەیاندووە .

٥ ــ د . ن . نوشاکۆف ، فەرهەنگی زمانـی رووسی ، ب١ ، مۆسکۆ ، ١٩٣٥ .

٦ ــ بە وێنە بروانە :

ا ــ شێخ محەمەدی خاڵ ، فەرهـەنگی خاڵ ، ب ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٤٠ ــ ٨٩ .

ب ــ گیو موکریانی ، فەرهـەنگی مـــەهاباد ، هەولێر ، ١٩٦١ ، ل ٢١ ــ ٥١ .

٧ ــ د . جەمال نەبەز ، خوێندنی کوردەوانی لە زانستگەی ئازاد لـە بـەرلین ، « گۆڤاری کۆلێجـی ئەدەبیات » ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ژ ١٩ ، ل ١٩٢ .

٨ ــ داوتر دەگەڕێینەوە سەر باسی ئەو وتارەی‌و هەندێ شتی دی دەربارەی دەخەینە پێش‌چاو .

٩ ــ ئەمانە ، ئەو پایە زانستی‌یانەن کە د. نەبەز وەری‌گرتوون ، وەك خۆی لە لاپـــەڕە (٦)ی کتێبی « زمانی‌یەکگرتووی کوردی »دا نووسیوێتی .



# کۆیەو شوێنەوارە بەنەخشەکانی

عبدالرقیب یوسف

تا ئێستا شاوی کۆیە (کۆیسنجق) سەرنجی سەیرانکارو گەشتو گوزارکاوانو شوێنەوارناسەکانی رانەکێشاوە چونکە نەزانراوە کە ئەم شاردیکوردستانی خۆشەویست لەبابەت هەندێك شوێنەوارو تەلاری گەورەو نەخش کراوی بە شێوەیەك گرنگو بەنرخە کە چاوی لێ تێر نابێ .

مرۆڤ ئەگەر بۆ جاری یەکەم بچێتە ئەم شارە زۆری پێ سەیر ئەبێ کە ئەبینێ کۆڵانەکانی پێچ پێچو لە هەردوو ڕۆخەکانیاندا خانووی بلند هەیەو زۆربەیان دوو قاتن بەڵام بەقەدەر خانووی سێ قات بلند نەبنو هەندێك جار مرۆڤ دەگەیەتە ڕاستی هەندێك «تاق» تاقی فراوانو بلندو هەریەکەیان هۆدەیەك یان پتری هەلگرتووەو لەژێریاندا هۆدەیەك یان دوکانی بچووك هەیە .

بە ڕاستی شاری کۆیە جوانترین نموونەیە بۆ شێوەی شارە کۆنەکان .

لە ساڵەکانی لەمەوبەردا چەند جارێك بەم شارەدا تێپەڕبووم بەڵام ئەم ئەزانی بەم شێوەیەیەو لەم بارەوەشدا شتێکی لەسەر بڵاونەکراوەتەوە ، تا ئەم هاوینە کە لەچەند دەستنووسێکی کۆنی کوردی ئەگەڕام ، لە هەولێرەوە تا قەڵادزە، چونکە شاری کۆیە لە گرنگترین شارەکانی کوردستان بووە لەبابەت زانستیو ڕۆشنبیرییەوە ، شاری حاجی قادرو دلدارو مەلای گەورەو گەلێك زانایانی تربووە ، لەم شارەشدا کەوتمە پرسیار کردنی ئەم دەستنووسانەو لەو کاتەدا چاوم بە چەند شوێنەوارێکی



نەخشـداروو مێـژوویی کـەوت ، وەکوو کۆشـکو باڵـەخانـەو قەیسـەریو مزگەوتو خان ، کـە هیچ ڕۆژێك هزرم نەئەکرد کە ئەم شارەخاوەنی ئەم سامانە بێو بـە پێویستم زانی کە یەك حەفتە لێی بمێنمەوەو وێنەی ئەو شوێنەوارانە بگـرمو بـە ووردی لـە سـەریان بنووسم ، کە ئەمە کورتەیەکـە لەو نووسینە .

دەربارەی کۆشـکو تـەلاری نەخش‌کراو ، ئێمە پەنجە بۆ چەند دانەیەکی درێژ ئەکەین ئەوانەش بە شێوەیەکی گەورەو بڵند ئاواکراون بە جوانترین شێوەی ئـەندازیاری ئاواکردنی خانوو لە کاتی خۆیدا ، دەوروبـەری دەرگـەکانیـانو پەنجـەرەکانیـانو بانـی تاقـە گـەورەکانیـانو هەروەها دەرگاو پەنجـەرەو بانی هۆدەکانیش لـە ناوەوە هـەموو هاتوونـە ڕازاندنو سپەحی کردن بە نەخشـەی ڕنلو جوانی جۆربەجۆر .

هەندێك لەم نەخشـانە لەسەر بەردە مەڕمەڕەکانیـان هاتوونـە هەڵکەندنو هەندێکیشیان لەسـەر گەچ هەڵکەندراونو هەندێکیان بـە بۆیـەی ڕەنگاو ڕەنـگ لـە ناوەوە دروست‌کراون بە شێوەیەکی بەرزی هونەرمەندیانە ، بە شێوەیەك کـە هیـچ شـارێکی تری کوردسـتانی باشـووری ئاگاتـە پلەی شـاری (کۆیە) ، لەم بابەتەوەو ئـەم جۆرە خانووە نەخش‌کراوانە نایەتـە دیتن لـەو شـارانـەی کـە جێگـەی فەرمانڕەوایەکانی کوردبوون وەکوو سلێمـانیو ڕەوانـدزو ئامێـدیو جزیرو بۆتانو بـەدلیسو فارقینو حەسـەنکەیفو سـابلاخ (مەهاباد) کـە خۆم بینیومـن بـەڵام ناتوانین بڵێـین لـە شـاری (مدیات)و (ماردین)یش خانووی وەهانییـە چونکـە جوانتـرینوبـەرزتریـن ئـەندازیاری ئاواکردنی خانوو لـە کوردستان‌دا لەوێیـەو خانووەکانی ئەم دووشاردو هەندێك شارەکانی تردا لە ویلایەتی ماردین لـەرووی دەرەوە زۆر بـەنـەخشو نیگاری جوان جـوان هاتوونـە ئاواکـردن (ئەمەش وێنەی خانوویەکـە لـە مدیات) .

ئەم جۆرە خانووە نـەخش‌دارانە بـەڵگەن لـەسـەر ئـەوەی پلەی پێشکەوتنی شاری کۆیە لە سەدەی نۆزدەهـەمداو هەروەها بـەڵگەن لەسـەر زەوقی جوانیو بـەرزی ئاغایەکانی غـەفوریو حـەوێزیو دەوڵەمەندەکانی ئەم شارە .

بەداخـەوە کـە هەندێك لـەم خانووانە خراپ کراونو هەندێکیان ماون بەڵام وەزعیان بـەرەو خراپی ئەچێت چونکـە خـەڵکی کۆیـەو خاوەنەکانیان بەتایبەتی نرخی ئـەم جۆرە خانووە نەخش‌دارانە نازانینو لەم‌بابەتەوە دواکەوتوون .

قەسری (ئەمین ئاغا ـ ئەختەری شاعیر) کوڕی (حاجی مەلا بەکرئاغا؛ مزگـەوتی گـەورەی ئاوا کردووە لەگەڵ قەیسـەریە کۆنەکەدا) یەکێك لەم قەسرانە بووەو یـەك پارچـە نەخشی جۆربەجۆر بووە بەڵام بـە داخەوە ڕووخاندوویانەو کردوویانە بە گەراجێکی پیسکەڵە کە بەکاریش نایـەت .

خانووی (حەمە ئاغا) لەم بابەتەوە گرنـگ بووەو پاش ڕووخانـدنـی ئێسـتا هـەر دەرگایـە مەڕمـەڕە نەخشـدارەکەی ماوە هەروەکوو لەم وێنەدا دیارەو ئەم دەرگایـە لـە مەڕمەڕی کۆیەیە کـە لـە دەرگاو پـەنجـەرەکانـی مزگـەوتو قەیسـەریـەکانو خانووی گـەورەو ئـەم جۆرە خانووانـەو خانووی تریش‌دا بەکارهێنراوە .

لەم بابەتـەوە خانووی کاکـە جافـو ڕەسـوول ئاغا زۆر گرنگە ، خانوویـەکی دووقاتـە ، تاقێکـی گەورە بە درێژایی خانوو لە نێوە ڕاسـتی قاتی سـەرەوەدا هەیـەو هەردوو ڕۆخی وی هۆدەن ، لـە هەردوو تەنیشتی تاقـە گەورەکـە نزیکی بانەکە دوو پەنجەرەی بچووك دیارن ، هەردووکیان بۆ ڕاکێشانی بایـە بـەرەو ناوەوە چونکـە دوو بۆشـایی دروسـت کراون بـۆ باخۆشکردن لە هاوینو زستان‌داو هـەروەها هەردوو بۆشـاییەکـە قورسایی لەسـەر تاقەکـەسووك ئەکەنو ئەبنـە هۆی مانـەوەی بۆ ماوەیـەکی زۆرتـر ، ئـەم جۆرە بۆشاییە لە ئەندازیاریی ئاواکردن‌دا لە کوردستان‌دا بەکارهێنراوە تا لە سەدەکانی ناوەندیداش بۆ نموونـە ئاشێکی وەها هەیە لەسەر ڕووباری



(زێوی)و (بێنات) لە بۆتان دەوری (٣کم) نزیکی دجلەیەو ئەم ئاشەش دەگەیە سەدەکانی ناوەندی ، بە بەردو گەچو زۆر ڕێك‌وپێك دروستکراوەو لە هەندێك جێگە لە کوردستاندا هەر بۆ ئەم مەبەستە واتە بۆ باخۆشکردنو سووك کردنی قورسایی بانەکان جۆرە بۆشاییەکی تر بەکارهێنراوە ئەوەش (شەربە)ی باریکو بێ دەستك کە پێی ئەڵێن (قەرەمید) دەیخەنە ناو بانی ئاواییدا وەکوو (مەدرەسەی میر ئاقدەلی) لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە شاری جزیریدا ئەوەی کە گۆڕی (مەمو زین)ی تێدایە . دوور نییە ئەم جۆرە ئەندازیارییە لە وولاتە گەرمەکانەوە گەیشتوویێتە کوردستان ، لە ناوچەی (کەرکووك)یش سەربەلە ئاواییدا بەکارهێنراوە .

لەسەر ڕووی خانووی کاکە جاف بە درێژایی دوو زنجیرە نەخش هەیەو لە نێو بەینی هەردووانەدا نەخشی گەورە گەورە هەن ، هەروەها لەسەر پەنجەرەکانیش نەخش هەیە ، لە ناوەوەش لە سەربانی تاقە گەورەکە زنجیرە نەخشی پانو جوان هەیەو لە تەنیشتەکانیشدا چەند نەخشێکی گیایی بە بۆیە یان بە مەرەکەبی ڕەنگاوڕەنگ هەیەو ئەڵێن لە سەر تاقەکە نووسینو مێژووی ئاواکردنی نووسراوە بەڵام چونکە بانی نێوەڕاست کەوتووە بۆیە لە ساڵی ١٩٦٣دا خراپ کراوە ئێتر منیش نەمتوانی سەری لێبدەمو بچمەسەری . هەروەها ناو هۆدەکان لە بانو لە سەر پەنجەرەکانو (ڕەف)ەکانیش نەخش هەیە .

ئەم خانووە لە لایەن کاکە جافو ڕەسووڵ ئاغا کوڕەکانی کەریم ئاغای غەفووری‌یەوە ، لە سەدەی نۆزدەهەمدا هاتووەتە ئاواکردن .

بەداخەوە ئەم خانووە کە وەکوو مۆزەخانەیەکەو پارچە هونەرییەکە ئێستا کراوەتەوە ئاخوڕی گوێدرێژو وڵاخان ، خەڵکی لادێ کە دێن بۆ ناو شار هەروەها هەندێك لە خەڵکی کۆیەیش گوێدرێژو وڵاخی خۆیان بە پارە ئەخەنە نێو ئەم مۆزەخانەیەوەو ئەمەش شتێکی جوان نییە بۆ خەڵکی ئەم شارە ، بە تایبەتی ڕۆشنبیرانو خاوەنەکانی ئەم خانووە کە نرخی نازانن . بێ گومان ئەگەر لە (بەغدا) بوایە بەدەیان جار وێنەکەمان لە تەلەفزیۆندا ئەدیت.

## خانووی حاجی تەها

ئەو خانووەی کە ئێستا بە تەواوی ساغلەمو ئاوەدان ماوە ، لەم جۆرە خانووانە خانووی حاجی تەهایە (خانووی سەمەدی حاجی تەها)شی پێ ئەڵێن ، خانوویەکی دووقاتی گەورەیە ، لە هەموو خانووەکانی‌تر پتر باسی نیگاری جوانی ئەکرێت ، لەم بارەیەوە زۆر شتێکی بەنرخە ، حاجی تەها کە یەکێك لە دەوڵەمەندەکانی کۆیە بووە ئەم خانووەی دروست کردووەو ئێستا لە دەستی عبدالخالق‌نجیب‌دایەو چەند ماڵێکی تێدایە ، لەبەر ئەمە نەم توانی بچمە نێو ئەم خانووە بۆ دیتنی نەخشەکانی .

## مزگەوتی گەورە

مزگەوتی گەورە لە شوێنەوارە نەخش‌دارەکانی کۆیەیەو دیوی دەرەوەی پەنجەرەو دەرگاکانی نەخش‌و نیگارێکی زۆریان لەسەرەو لەناوەوەشدا چەندین نەخش لەسەر میحرابە مەڕمەڕە جوانەکەی هەیە جگە لە نووسینی تر وەك ئایەتی قورئانو چەند دێرە شیعرێکی فارسی کە لەمانە تابلۆیەکە هەشت بەیت شیعری لەسەر نوسراوە لەگەڵ ناوی ئەو کەسەی ئاوەدانی‌کردۆتەوە .

مزگەوتەکە حەوشێکی گەورەی هەیە کە لەسەر شێوەی ماڵی



نووشەوە کەوانەیە دە ژوور (حوجرە)و مەدرەسەیەکی تێدایە ئەم مەدرەسەیە ژوورێکی گەورەیەو تایبەتی‌یە بە دەرس وتنەوەو مامۆستا لەم ژوورەدا دەرسی بە فەقێ‌یەکانی وتۆتەوە . ئەوی راست بێ مەدرەسەکە بریتی‌یە لەم ژوورەو دە ژوورەکە . ئەم مزگەوتە گەورەترین مزگەوت‌و مەدرەسەی کۆیەیەو زۆر لە پیاوی ئاینی‌و زاناو مەلا لەم مەدرەسەیەدا لەلای مامۆستای بەناوبانگ بەتایبەتی ئەوانەی سەر بە بنەماڵەی جەلی‌زادە بوون دەرسیان خوێندوەو ئەم بنەماڵەیەش باشترین زانای ئاینی کوردستانیان لێ‌کەوتۆتەوە بەتایبەتی مەلای گەورە (مەلامحمد)و مەلاعبداللەی باوکی‌و مەلا اسعدی باپیری .

**وێنەی نەخشەکانو نووسینەکانی مزگەوتەکە باش دەرنەچوە چونکە لەم دواییەدا بە بۆیەی سەوز بۆیاخیان کردوون .**

ئەم مزگەوتە لە ساڵی ١٢٦٠ی کۆچی (١٨٤٤ز) لەلایەن ملا بکراغای کوری محمدی کوری حویز ئاوەدانکراوە هەروەك ئەم مێژووەو ناوی ئاوەدانکارەکەی لەسەر تابلۆی ناوبراو نووسراوە ، بەڵام سلێمان (یان سلمان) کوری روستم اغا کە ئەویش ناوی لە تابلۆکەدا هەیە ئەوا یان شیعرەکانی داناوە یاخود نووسیونی‌یەتەوە . مەلا بەکراغا بەپارەو ماڵی تایبەتی خۆی ئەم مزگەوت‌و قەیسەریە کۆنەکەی ئاوەدانکردۆتەوەو بێ‌گومان ئەم دوو کارەش پارەیەکی زۆری ویستوەو دەساڵ دوای دروستکردنی مزگەوتەکە مردووە واتە لەساڵی ١٢٧٠ی کۆچی‌و رستەی (واثانی ثنین محمد) مێژووی مردنەکەیەتی هەروەك مامۆستا ملا رؤوف‌و مامۆستا طاهر احمد حویزی نووسەری کتێبی (مێژووی کۆیە) بۆیان دووپاتکردەوە . بەڵام ئەمەی دواییان لەکتێبەکەی‌دا وەك من بۆی ئەچم باسی مێژووی مردنی نەکردوەو ئەو شوێنەوارانەشی باس‌نەکردوە کە ئێمە لەسەریان ئەنووسین .. بەڵام مامۆستا مسعود محمد باسی‌کردوە کە مردنەکەی لەساڵی ١٢٧٠ی کۆچی ( ١٨٥٣ — ١٨٥٤ی زایین)بووە ئەویش لە کەتێبەکەی‌دا (اعادة التوازن الی میزان مختل : ص٢٨ ، ٢٩ ، ٨١) ئەم رستەیەش هی حاجی قادری کۆیە لە هەڵبەستێك‌دا کە بۆ شینی حاجی بەکر دایناوە .

● **قەیسەریی کۆن** ●

لەنێو بازاری کۆیەدا دوو قەیسەریی کۆن هەیە ، یەکیان پێ‌دەڵێن قەیسەریی کۆن ، ئەم قەیسەریە لە باکوور بەرەو باشوور دێت ، دوو دەرگای گەورەی هەیە ، یەك لە لای باشوورەوە‌و، یەك لەلای رۆژهەڵاتەوە ، دەرگاکانی گەورەن ، بە بەردی مەرمەری کۆیە ئاواکراوە، نیگارو نەخشەی جوان لەسەریان هەڵکەنراون‌و ، ئەم نەخشانە کاری لە نەخشەکانی قەیسەریی نوێ کردوە . بانی ئەم قەیسەریە (عەقد)ەو بە گەچ‌و بەرد بەرد ئاواکراوە . دوکانەکانی بە ماوەی نیو مەتر یان پتر لە زەوی بلندن‌و بەردەمیان دەبێتە سەکۆیەکی درێژ لەم سەر تا ئەو سەر .. دوو ریز دوکانی تێدایە ، بەڵام نازانم ژمارەیان چەندە ، ئێستاکە کەسی تێدا نیە تەنیا یەك بەرگدروو نەبێت کە بۆتە گەورەی خانەکە .

ئەم قەیسەریە لە سەدەی نۆزدەهەمدا لەلایەن (حاجی مەلا بەکر)ی کوری محەمەد کوری حەوێزەوە ئاواکراوە کە لە کاتی خۆیدا دەوڵەمەندو گەورەترین پیاوی کۆیە بووە ، بەڵام نازانین لە چ ساڵێك‌دا ئاوەدانی‌کردوە . مامۆستا مەلا رەئووف کە یەکێکە لە نەوەکانی ئەمین ئاغای کوری حاجی مەلا بەکرو تەمەنی دەوری (٨٣) ساڵە دەڵێت : نیازی حاجی مەلا بەکر ئەوەبوو قەیسەریەکە بکات بە (وقف)ی مزگەوتی گەورە ، بەڵام



بەسەردا مردو ئیتر ئەمین ئاغا ئەی‌کردە (وقف) . ئەگەر ئەم قسەیە وابێت دەبێت پاش مزگەوتی گەورە ئاواکرابێت یانی پاش ساڵی ١٢٦٠ ی‌ك (=١٨٤٤ی‌ز) چونکە لەم ساڵەدا حاجی بەکر ئاغا کۆتایی بە ئاواکردنی مزگەوتی گەورە هێناودو بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین تەمەنی ئەم قەیسەریە نزیکی (١٤٠) ساڵە .

## قەیسەریی نوێ :

ئەم قەیسەریە دەکەوێتە تەنیشتی چەپی قەیسەریە کۆنەکەو بەرامبەریەتی ، بەڵام لەو گەورەترو جوانتر ئاواکراوەو لەسەر جوانترین‌و نوێترین شێوەی ئەندازیاریی قەیسەریەکان لەو کاتەدا ئاوەدان‌کراوە ، دوورنیە ئێستا جوانترین قەیسەریی کۆن بێت لە عیراقدا ، چونکە لە مووسل‌و بەغداو کەرکووك‌و بەسرا ، چاوم بە قەیسەریێك نەکەوتوە کە لەسەر شێوەی ئەم بێت .

قەیسەریە نوێیەکە چوار ریز دوکانی لەنێودا هەیە ، لەنێوبەینی هەردوو ریزدا دیوارێکی پانی هەیە. دوکانەکانی وەکو دوکانی قەیسەریە کۆنەکە لە ئەرز بڵندترەو بەردەمی هەر ریزێکی سەکۆیێکی درێژ هەیە، بانەکەشی بڵندەو عەقدەو دووریز گومبەت لەبانەکەیدا هەیە لەگەڵ چەند پەنجەرەیێك لە هەر ریزە گومبەتێکدا بۆئەوەی روناکی‌و تیرۆژی رۆژ لەنێو قەیسەریەکە بدات .

پێنج دەرگای گەورە لە قەیسەریەکەدا هەیە دوو دەرگا دەکەونە لای رۆژئاواو هەر لایەکی تر یەك دەرگای هەیە .

دەرگاکان بڵندو فراوانن‌و لە مەرمەڕی کۆیە ئاواکراون ، هەروەها مەرمەڕی لە ژووری قەیسەریەکەش‌دا بەکارهێنراوە . لەسەر دەرگاکانی نەخشەی جوان جوان هەیەو نەخشەکانی دەرگای باکووری بەشێوەیێکی تایبەتیە .

ئەم دەرگایانە دارن‌و بە مێخی گەورە تەختەکانی توندکراوە .

نازانین ژمارەی دوکانی نێو ئەم قەیسەریە بەتەواوی چەندە ، بەڵام هەندێك دەڵێن سەد دوکانە ، ئەوی بابەتی گوتنە لەلای دەرمەوەش گەلەك دوکانی هەیە وەکو قەیسەریە کۆنەکەو دوو ریز دوکانەکانیان بەرامبەر یەکن‌و ئێستا بەکاردەهێنرین ، بەڵام دوکانەکانی ناوەوەیان چۆڵەو هەردوو قەیسەریش قایم‌و پتەون ، تەنیا بانیان پێویستی بە سواخکردن هەیە .

ئەم قەیسەریە نوێیە لەلایەن (حاجی عبدالله مسکین رەبەن)ەوە ئاواکراوە کە یەکێك‌بوو لە دەوڵەمەندەکانی شاری کۆیەو دەڵێن لە ئەوەڵەوە ژیانی وانەبووەو لە گوندی (تیمارۆك)ی نزیکی شار دانیشتوە ، دەستی بە وردەواڵە فرۆشتن کردوە ، لەم دێیە بۆ ئەو دێ وردەوردە دەوڵەمەند بووەو هاتۆتە نێو شارو بوو بە بازرگانێکی ورباو چالاك .

دەڵێن (حاجی عبدالله مسکین رەبەن) لە (ساڵی رشانەوە)دا مردوە ، لەو ساڵەی کە زۆر کەس لە خەڵکی کۆیە بە نەخۆشی جۆرە تاعۆنێك مردون . مێژووی ئەم ساڵەشی لەنێو کاغەزەکانی مامۆستا مەلا رەئووفدا هەبوو پیشانی‌دام ئەوە ئەم ساڵە بوو ١٣٢٢ ی‌ك (=١٩٠٤/١٩٠٥ی‌ز . دەڵێن کاتێ حاجی مرد کەم‌وکوڕیەك لە قەیسەریەکەدا مابوو کوڕەکەی (زاهیر چەلەبی) تەواوی‌کردوە .

وەها دەردەکەوێت کە تەمەنی ئەم قەیسەریە جوان‌و بەنرخە لە حەفتا ساڵ تێپەڕدەبێت .

## خانی گەورە :

ئەم خانە کە (خانی مەحموود ئاغا)شی پێ‌دەڵێن دەکەوێتە نێو بازاڕە کۆنەکەی کۆیەوە بەلای باکوورەوە خانێکی گەورەو زۆر رێك‌وپێکەو ، ئەگەر خانی وەها نیمرۆ لە عێراقدا هەشبێت بەڵام کەمە .

ئەم خانە چوار گۆشەیەو دوو قاتەو لە (٦٠) هۆدەو ئاخووڕو دوو دوکان پێکهاتوە ، (٣٠) هۆدە بۆ مرۆڤان لە قاتی سەرێیەو (٣٠) هۆدەو ئاخووڕ لە قاتی خوارێش هەیەو ، هەردوو دوکانەکەش دەکەونە هەردوو تەنیشتی چوونە ژوورەکەی ـ هەروەها حەوشێکی گەورەی هەیەو دوو رێگا بە قادرمە دەچێت بۆ قاتی سەرێ .

دەرگای خانەکە دەرگایەکی

فراوانو بلندو گەورەیەو بە بەردی مەرمەڕی کۆیە دروستکراوەو زۆر نەخشی خوانی لەسەرە ، هەروەها پێنج دێرە شیعری فارسی لەسەر ئەم دەرگایە گەورەیەو بە خەتێکی فارسی‌ی زۆر جوان نوسراوە .

ئەم خانە بــە گـەچو بـەرد ئاواکراوەو بەردی مەرمەڕیش لـە رۆختی هەنــدێك هۆدەکانـــی بەکارهێنــراوەو هەندێکیانیشــ نەخشکراوە ، بانی خانەکە عەقدە .

لــە ســـالی (١٢٧٧ی‌ك) = (١٨٦٠ – ١٨٦١ی‌ز)دا لەلایـــەن (مەحموود ئاغا)وە ئاواکراوە کـــە باوکی حەمە ئاغای غەفووری بووە ، هەروەکو ئەم مێژوویە بە ڕەقـــەم لەسەر دەرگایەکە نووسراوە هەروەها مێژووی ئاواکردنی بــە حیســـابی (ئەبجەد)یش لەسەری نووسراوە کە لەم نیوە دێرە شیعرە فارســــییە پێکهاتووە .

(محموود باد عاقبت این کار وا نـسرا) ووشەی (محموود)یش لێرە بە ڕێگای (توریە) بۆ ناوی ئاواکەری خانەکەیە (محمود ئاغا) .

ئەمەش ئەو نووســینەیە کـــە لەسەر دەرگایەکەیەتی :

چون این بنای خوبو خوشــ آمد بستی مرا

لازم بود کە وصف نمایم بجان ورا

توفیق شــد رفیقو گرنە درین زمان

این (فارا) این همم ندهـــد دست هرکرا

ای آنکە ین بنای مبارك نهادە

خواهم کە حق بخیر موفق کند ترا

حقا بنای خان تو رونق بلوری دار

هرکەس طالب است بسیرش بکودرا

ناظم یکی بیامـــدو تاریخ گفتو رفت

محموود باد عاقبت این کار وا نــسرا

ئێستا خانەکە ساغلەمەو پتەوەو ئیش‌دەکاتو هەموو ساڵێك بـــە ئیجارەدەدرێتو هەموو رۆژێك بڕێك کەرو وڵاغی تێدایـــەو هۆدەکانـــی ســـەرێش هەندێك کەســـی دەستکورت وەزعی دارایيان باش نیەو هەنـــدێك کرێکاری تێـــدا دەنوونو گـــەورەی هـــەموویان (امــــــەلا محـــەمـــــــەد)ە کە پیاوێکی بێ‌ژنو ماڵەو هەر ژیانی لەم خانەدا دەباتەسەر . کەمێك لای دانیشتم لە هۆدەیێکی بچکۆلـــەو چلکن کە دیارە ئەوا چەند ساڵێکە پاکنـــەکراوەو لە دووکـەڵیشـــدا



رەشبووە ، چەند دڵۆپی عـــەرەقی لەو گەرمای تەموزدا لە رووەتی دەهاتەخار ، دیاربوو شتێکی کــەم . خوێنــدبوو ، بەڵام خەتەکـــەی خۆشبوو گلەیی لە خەڵکەکە دەکرد کەحورمەتی ناگرنو بە شێتۆکـەی دەزانن .

(حاجی موستەفای ناڵبەند)یشــ هەر لەم خانەدا هۆدەیێکی گرتوەو ئیشی ناڵبەندی دەکات ، ئەگـــەر چەند تەمـــەنی گـــەیشتوە دەوری هەفتا ساڵی‌و یان تێپەڕیوە .

لە کۆتاییدا داوا لە (المؤســـسة العامة للاثار) دەکەین کە ئەم ئاسارە بەنرخانـــەی کۆیــە بپارێزێــتو سەرپەرشتییان بکات .

# دەربارەی وەرگێڕانی (گێلە پیاو)ەوە

کتێبی (گێلە پیاو) بە قەڵەمی نووسەری ناسراوی ئەم سەردەمەی تورك : عەزیز نەسین ، کاك عەبدوڵڵا حەسەن زادە کردویەتە کوردیو ، دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی لە وەزارەتی ڕۆشنبیریو هونەری کۆماری عیراق بڵاوی کردۆتەوە .

کاك عەبدوڵڵا دانەیەکی لەو کتێبە بۆ من ناردبوو، داوای کردبوو ڕای خۆم لە بارەی کارەکەی بنووسم . بۆ ئەوەی لە قسەی ئەو برادەرە خۆشەویستە دەرنەچم ، نەختێ لەم بارەیەوە دەدوێم .

عەزیز نەسین نووسەرێکی (ساتیریك) یا خۆمانە بڵێین : بە تەوسو توانجو تیتاڵییە . نەشتەری قەڵەمەکەی لە کوانو دمەڵی کۆمەڵ دەداو کێم زوخاوی دەردەخات . بە تەردەستی (ئەوەی لە دیزەدایە بە ئەسکوێ دەری دەهێنێ) . بە ڕاشکاوی ، چەوتو چەوێڵیو نالەباری یەکانی ڕێژێمی فێودال ـ بورژوایی وڵاتی خوی وەبەر لیسو تیلای گاڵتەو تیتاڵی دەداو ئاگری پێکەنینی پێوەدەنێ . وای گڕ تێبەردەدا ئەگەر چاوی کۆنەپەرستی بارانی پەلەشی بەسەردا ببارێنێ ناتوانێ دای مرکێنێ . لە (گێلە پیاو)یشدا هەر وای کردوە .

**عەزیز نەسین بۆ نووسینی (گێلە پیاو) ڕەنگە لە ڕۆمانی (چارە ڕەشەکان ـ البؤساء)ی ڤیکتۆر هۆگۆ (۱۸۰۲ ـ ۱۸۸۵) ئیلهامی وەرگرتبێ . لە چیرۆکی (گێلە پیاو)دا کە دەگەیە لاپەڕەکانی (۲۰۳ ـ ۲۰٦) کە (گێلە) دەبێتە بەڕێوەبەری قوتابخانەو بەم بۆنەیەوە جێژنی بۆ دەگرنو ، لە جێژنەکەدا دەیەوێ پێشینەی خۆی بدرکێنێو دەڵێ : (ـ هاوڕێیان ! ڕێگا بدەن پێ لە گوناهی خۆم بنێم . زیاتر لەوە ناتوانم خۆم ڕاگرم . من توشی ئازاری ویژدان بوم . وەرن بمگرن!) تەواو ، ئەو دیمەنەت بیر دەکەوێتەوە کە پاڵەوانی ڕۆمانەکەی ڤیکتۆر هۆگۆ سەرۆکی شارەوانییەو زۆر خزمەتی شارەکەی کردوەو ، کردوەو ، لەلایەن ئیمپەراتۆرەوە . نەقەبو نیشانی بۆدێ ، بەم بۆنەیەوە جێژنی بۆ دەگرنو لە جێژنەکەدا ڕاستی خۆی دەڵێو خۆی بەگرتن دەدا .** ئەمە نابێتە کەمو کوڕی بۆ کارەکەی عەزیز نەسین . نووسەری گەورەی وا لە دنیادا کەم نین کە ئیلهامیان لەیەکتر وەرگرتوەو ، تەنانەت (اقتباس)یشیان لە کاری یەکتر کردوە . بۆ نموونەی (اقتباس) ووتەیەکی ماکسیم گۆرکی دەگێڕینەوە کە دەڵێ : (کاتێ هەوەڵجار «فاوست»م موتالاکرد نزیکەی بیست ساڵانە بوم ، دوای ماوەیەك تێگەیشتم کە دوو سەد ساڵ پێش «گۆتێ»ی ئەڵمانی ، کەسێکی ئینگلیسی کە ناوی «کریستۆفێر(۱) مارلۆ»بوە ، بەسەرهاتی «فاوست»ی نوسیوە . . . وە تەواوی ئەو کتێبانەی لە بارەی «فاوست» نووسراون لە سەرچاوەی ئەفسانە یەکی سەدەکانی ناوەڕاست هەڵقوڵیون) .

ڕەوتی چیرۆکەکە لە لاپەڕەکانی (۷۸ ـ ۷۹)دا وەکوو جێگاکانی دیکەی ڕەوان نیەو نەختێ ئێلە . لەو جێگایەدا (گێلە) سەروکی لقی بانکە لە قەزایەك، ئەفسەرێك کە دراوسێی هۆدەو ئاشنایەتی ، شەوێك جلکەکانی (گێلە) وەردەگرێو پێیانەوە دەچێتە سەر بانگەهێشتنو دو شەوو دوڕۆژ نایەتەوە . دواجار فەرمانبەری دایرە دێ بە دوای (گێلە)دا کە بچێ بۆ دایرە ، لەبەر بێ جلکی ناتوانێ بچێ . ئاخرەکەی جلکی ئەفسەرەکە دەکاتە بەرێو دەچێ . . .

لێرەدا وەڵامی ئەم پرسیارانە دیارنیە : لە قەزایەکی بچوك ئەو ئەفسەرە چۆن دوو شەوو دوڕۆژ سوراغی نیە ؟ چۆن نەچۆتە سەرکار ، ئەگەر چوە چۆن بە جلکی ئەهلیەوە چوە ؟ گێلە کە سەرۆکی لقی بانکەو پارەشی هەیە چۆن تاقە دەستێکی جلك

# حسن قزلجی




هەبوە ؟ بۆچی پارەی نەداوە بە فەرمانبەرەکە بچێ دەستێ جلکی بۆ بکڕێ ؟ یا نەی‌ناردۆتــە لای یەکێ لەوانەی لەژێر دەستی‌دا کاریان‌دەکرد دەستێ جلکی بۆ بخوازێتەوە ؟ نوسەر بەسەر ئەوانەدا تێپەڕیوەو بە پەلە (گێلە)ی بە جلکی ئەفسەری‌یەوە ســـواری تەتار کردوەو ، بــەرەو بەســـــەرهاتەکانی دوایــی خستویەتە ڕێ .

بە هەرجۆر ئەمە وەکو سەرەتایەکی قســـە ، ئیشارەیەکی بچوك بو بۆ چیرۆکی (گێلە پیاو) ئەگینا لێکۆلینـــەوەی چیرۆکێکی (۳۸۰) لاپەڕەیی ، هـــەروا بەدەم ڕێوەو بە سوكو هاسانی سەرناگرێ .

**ئێستا دێینە سەر ئەسلی مەبەســـت کـــە وەرگێڕانەکەی کاك عەبدوللایە . وەرگێڕانێك بە باش دەژمێردرێ کە لەپێش هەموو شتێك‌دا ووشـــەکان دروستبێ ، ووتەکان پڕ پێبـــت لـــە قالبی زمانی کوردی‌دا داڕێژابێ ، مانای ووتەکانی تێکستە ئەسلیەکە بەڕۆشنی گەیێندرابێ ، ڕەوتی مەبەســـتەکە لـــە وەرگەڕاوە کوردی‌یەکەش‌دا ڕەوانو بێ‌گرێو گـــۆل بێ . بە کورتی ئەوەندە ڕێکوپێك‌بێ ، ئەگەر لە سەدا سەدیش نەبێ ، بەلانی کـــەمەوە تا ڕادەیەکی زۆر خوێنەر وای‌دانێ کە ڕاستەوخۆ بە کوردی نووسراوە. هەستی ئەمە کە لە زمانێکی ترەوە بە ناڕەوانی کراوە بە کوردی ، هەر تاوە ناتاوێك وەکو چقڵ بە چاوی‌دا ئەچێو هەراسانو جاڕزی ئەکات .**

وەرگێرانەکـــەی کاك عەبدوللا لـــەم بارەیەوە تەواوە . ووشەکان دروستن‌و ، وەکوو گای مۆزکردو پاش‌و پێش‌و ئەم لاو ئەو لایان پێ‌نەکراوەو لە جێی خۆیان‌دان . ووتـــەکان ڕێکوپێکـــن . ڕاوێژی دەم‌و قەلەم ڕەوانەو ، مەبەســـت‌و مانا ئالۆزو کوتبچـــڕ نەبووە . خوێنـــــەر دەتوانـــێ تا ڕادەیـــەکی زۆرو بگرە نزیکەی سەدی نەوەدو پتریش لە تێکســـــتە کوردی‌یەکە دلنیابێت‌و بیری خۆی بەڕەوتی چیرۆکەکەوە خەریك بکات . نالێم لە سەداسەد . چونکـــە جارو بارو کـــەم کورتێك پێچـــەوانەی ئەمە دەبینرێ . هەروەها کە دەشلێم (تێکستە کوردی‌یەکە) مەبەستم بە چەشنی گشتیە ، تا دئیالێکتیش بگرێتـــــەوە . پاشان دەگەڕێینەوە سەر ئەم دوو مەبەستە .

عەزیز نەســین وەکوو گوتمان نووســـەرێکی (ســـاتیرێك)ە ، چزووی قەلەمی لـــە کارو کردەوەو نەرێت‌و ئاکاری چینی سەرەوەی کۆمەل دەچەقێنێ‌و ، بۆ چینەکانی خوارەوەو هەرەمەی خەلك دەنووسێ . لەبەر ئەمە بـــە زمانی ئەمـــــان ، یانی سادەو ڕەوان دەنووســـێو زاراوەو کینایەو مەجازو ئیشـــــارەو تەوس‌و توانج‌و قـــەی ئەستەق‌و پەندی پیشینانی ئەمان زۆر لە کار دەکاو دەهێنێ . سەبارەت بەمـــە وردگێڕانی نووسراوەکانی ئەو کارێکی سووك‌و هاســان نیە . کەسێك دەتوانێ وەریان‌گێڕێ کـــە لە زمانـــی هەرەمەی گەلی کورد زۆر شارەزا بێ‌و بەرامبەرەکانی ئەو تەوس‌و توانج‌و تەنانەت جنێوانە .. لە کوردی‌دا بدوزێتـــەوەو لــــە جێگای خۆیان‌دا دایان نێ . دەنا ئەگەر ووشە بە ووشە بیانکاتە کوردی شتێکی زۆر بێ‌تام‌و بێزراوو پووچەلیان لێ‌پەیـــدا دەبێ . کاك عەبدوللا ئەم کارەی زۆر جوان لە دەست هاتووە ، وەك ئەمانەی خوارەوە :

لاپەڕە ٧٦

ـ (دوکچی **فەیرەی** هەبون) « ١٣٨ (ناوك)یش دەگوترێ .

ـ (سەرلەنوێ **نێوکم براو ناوم نرا**«کامل») « ١٤٠

ـ (ئەو **جینگەنەیی** جارانم نەمابو) « ١٤١

ـ (**هاورێشمی خاسە ڕەنگ** ... ) « ٢١٤

ـ (دێیەکی زۆر **چەپەڵو پەنا** ... ) « ٢١٧

ـ (لە شوێنێکی **پەسیو** پاروەنانێك پەیداکەم) « ٢٢٥

ـ (ئاراموو **تۆقرەم** لێهەڵگیرابو) « ٢٢٥

ـ (کوڕینە ! لە تەنگانانەدا هەمیشە پشوتان سەرخۆبێ) « ٢٢٦

ـ هەر لەگەڵ چاوم بە **ڕوکاری** سەرۆك کەوت ناسینەوە) « ٢٢٦ (ڕوکار) بە مانای ڕوخسار ، زۆر جوانە

ـ (دوبارە دەتگرنەوەو **دات دەکەنەوە**) « ٢٤٤

ـ **چما** تا ئێستا نەتدیوە ...) « ٢٥٠

ـ (تەححا . ! ئەدی چۆن ...) « ٢٥٣

ـ (ئاغا ! لە **خۆڕینی** باش‌نیە) « ٢٨٢

ـ (بە جارێك زەندەقی‌بردم) « ٢٩٦

(زەندەق) لە (زەند)و (زەندە) وەرگیراوە کە دوو ووشەی زۆرکۆنن . ئەوی هەوەڵیان بە مانای گیانو ڕۆحیش هاتوە ، دوەمیان بە مانای گەورەو مەزن . پاشان بۆتە (زەندەك)و کافیش گۆڕاوە بە قافو بۆتە (زەندەق) . بە مەجاز بە مانای (جورئەتو جەسارەت)ە .

**ـ (بورهان شەیپوری قوڕبەسەر دەم لە پوش‌بو)** لاپەڕە ٢٩٧

**ـ لەوەی ئەو ئینسانە دلپاکو نیاز پاکانەم فریو دابو بە خۆمدا دەشکامەوە** « ٢٠٤

**ـ (گیرفانیان بڕیبوەو بە فلسم دەکوت فەتاح‌بەگ)** « ١٩٥ پتر (فەتاح پاشا) دەگوترێ .

**ـ (هێشتا لە قولکەیەك ڕزگار نەبیوم خەریك‌بو بمخاتە چالێکەوە)** « ١٩٦

**ـ (پێش .. ئەوەی ئۆرهانی ئەسلی بێ‌فیز مالکی بدەمێ)** « ١٩٢

**ـ (بەلام تازە لەچی دەترسام ، پاش ڕوت‌کردنێ تەشتی تەلا لەسەر سەرت دانێ)** « ٢١١ ـ پتر دەلێن : (تەشتی تەلا بە سەرمونێ)

**ـ (ئەوان نەیان دەزانی من بەچی دەخوڕەو پشتم بە چ ئەستورە کە قسەم وانێرن)** « ٢١١

ـ (باش پێوەبیوم ، ئەم لام تاتو ئەو لام تات) « ٢٨٢

(تات) بە مانای بەردی‌پان و درێژە ، وەك : (تاتە نوێژ) ، (تاتە شۆر) یەکەمیان بەردی نوێژ لە سەرکردنە ، دوەمیان بەردی مردو لەسەر شۆردن . لە گۆرانی‌دا هاتوە : «لە سەر تاتەشۆر هەر تۆم لەبیرە» .

(ئەم لام تاتو ئەو لام تات وەی‌دایە جیقم دەرهات) مەتەڵوکەیە بۆ (ئاش) .

ـ (ژنەکە دەستی‌کرد بە بۆڵەبوڵ : ئەتۆش سەگت بە دیاری بۆ هێناوین) لاپەڕە ـ ١٣٠

ئەمانە هێندێ نموونە بون لەو وشە ڕەسەن و کینایەو مەجازو قسە ئەستەقە جوانانەی کە لە ...و هەڕەمەی خەڵکدا باون و کاك عەبدوڵلا لە وەرگێڕانەکەی خۆیدا هێناونی .

لەپێشدا گوتمان : (خوێنەر دەتوانێ سەدی نەوەدو پتریش لە تێکستە کوردیەکە دڵنیابێ) . ئەو سەدی چەندەی دیکەمان بۆ ئەوە هێشتەوە کە کاکی وەرگێڕ جاروبار لە وەرگێڕانەکەیدا وەدوای تێکستە فارسیەکە کەوتوە ، وەك :

– (پیوو) لاپەڕە (١٨٠)کە وشەیەکی تورکیەو وادیارە وەرگێڕی فارسی هەروەك خۆی هێناویەتی. لە کوردیدا دەڵێن : (هەی هەی) ، (حەیە حەی) . ژنان (ئەللەل)یش دەڵێن . خۆشی لە پەڕەی (١٤١)دا (هەیهو)ی هێناوە کە زۆر جوانە .

– (بە چ ڕویەکەوە ددمتوانی بچمەوە لایان) لاپەڕە (١٨٠) . وابزانی وا جوانتر بو بگوترێ : (چۆنم لەڕو دەهات) ، (چۆن لەڕوم هەڵدەهات) ، (چۆن بە خۆدا دەپەرموو) .

– (گوزەرانی پێدەکەم لاپەڕە (١٨٢) . کوردیە ڕەسەنەکەی ئاوایە : (پێیبەڕێ دەچوم) . (گوزەران)یش بەڕێچونە .

– (بەڵام ئەو دەسڕبەردار نەدەبو) لاپەڕە (١٨٤) . لە کوردیدا دەگوترێ : (بەڵام ئەو دەستی هەڵنەدەگرت) ، (... وازی نەدەهێنا) ، (لە کۆڵ نەدەبۆوە) .

– (چ دەبێ بکەم) لاپەڕە (١٨٥) . باشتر بو بگوترایە : (دەبێ چ بکەم) .

(پاش حەوت – هەشت ساڵ رابردوەکەم لە بیر خەڵك دەچێتەوە) لاپەرە (١٤١) . ڕەنگە (پێشینەکەم) جوانتربێ . خۆشی لەلاپەڕە (٢٤٧)دا ئەمەی بەکارهێناوە .

– (ئەوەندە دەستو پێی خۆم ونکردبو) لاپەڕە (٢١٥) . وشە بە وشە وەریگێراوە . کورد ئەمە نالێ . خۆشی هەر لەو لاپەڕەیەدا ، لە جێگایەکی دیکە کوردیە ڕەسەنەکەی هێناوە : (ئەمن ئەوەندە تێكچوبوم) . یادەگوترێ : (ئەوەندە سەرم لێ شێوابو) ، (ئەوەندە پەشۆکابوم) ، (ئەوەندە پەشێو بوم) .

– (هەچۆنێكبو هاتنی من لەگەڵ جێژن و شادمانی خەڵك بەرەو ڕوبو) لاپەڕە (٢٣٢) . وەرگێڕانەکە وشە بە وشەیە . ددبو بگوترێ : (کە من گەیشتمێ خەڵك لە خۆشیانا کردیانە جیژن و شایی)، (هاتنی من بوە جیژن و شایی بو خەڵکەکە) .

– **(ئاغا گولی‌کردو** لە قاقای پێکەنینی دا) لاپەڕە (٢٤١) . کاك عەبدوڵلا وەدوای تێکستە فارسیەکە کەوتوە ، وەرگێڕی فارسیش وادیارە دوای تورکیەکە کەوتوە . لە تورکیدا دەڵێن : (ئاگا گولدی) یانی ئاغا پێکەنی . بەڵام لە فارسیدا ناگوترێ : (آقا گل کرد). بەڵام دەگوترێ (آقا محبتش گل‌کرد) یانی مەحەبەتی بشکوت . دەبو بگوترێ : (ئاغا وەك گوڵ گەشاوەو لە قاقای پێکەنینیدا) .

– «ئێمە هەمیشە کەسێکمان دەوێ خەڵکی سەرگەرم بکا» لاپەڕە (٢٤٢) . دەبو بگوترێ : (خەڵکەکە سەرقاڵ کا) ، (خەڵکەکە بخافڵێنێ) ، (خەڵکەکە خەریك‌کا) .

– (نەیدەتوانی خۆی بپارێزێو پەتەی کەوتە سەرناو) لاپەڕە (٢٤٢) . وەرگێرانەکە وشە بە وشەیە. دەبو بگوترێ : (نەیدەتوانی وریایی خۆیبکا ، یا نەیدەتوانی ئاگای لە خۆی بێ و باقری دەرکەوت) ، (... لێی‌ئاشکرابو) .

– منیش بەتەنی لەو کیوو وەجان هاتبوم) لاپەڕە (٢٥٣) – (گەیشتبوە گیانم) ، (لە گیانی خۆم وەڕەز ببوم) .

– (بۆ خۆشم نەمدەزانی سەرەنجامی ئەم کارە بە کوێ دەگا) لاپەڕە (٢٥٤) – (خۆشم نەمدەزانی ئاخرەکەی ئەم کارەدەگاتە کوێ) ، (خۆشم نەمدەزانی لەم کارەدا چم بەسەردێ) .

– (دەرگای وا لە ناکاو کردەوە کە سواخی ئەم لاو ئەو لای هەڵوەری) لاپەڕە (٢٥٨) – (ددرگای وا توندو لەناکاو کردەوە کە سواخی **لاشیپانەکانی** بەربۆوە – یا کەوتە خوارەوە) .

– (پەیکەری زل و زەبەلاحی جەنابی ئەفیب وەژوورکەوت) لاپەڕە (٢٥٩) . پەیکەر ووشەیەکی فارسیە بە مانای (صورت و جثه) ی عەرەبیە . نالیش لە کوردیدا بەو مانایەی بەکارهێناوە : (هەی کەرێکم بو چ‌پەیکەر تەیکەری هەورازو لێژ) . ئێستا لە کوردیدا بە مانای (تمثال – مجسم) بەکاردێ . لە جێگای وادا (قەلافەت) باشترە ، وەك شێخ ڕەزا لە باسی کەلەشێرەکەیدا دەڵێ : (بە قەلافەت وەکو مەولان بەگەکەی ...) .

ـ (من زۆرم ئەو شـــیرنیکاری‌یانە دیبو) لاپەڕە (٢٦٠) . شیرنیکاری وشەو زاراوەیەکی فارســی‌یە بە مانای مەخـــرەو گەپ‌و گالتــەیە . لە کوردی‌دا بارنیە . لەجیاتیان دەبو بکوترێ : (... زۆرم ئـــەو کونکە لانەبەسەر هاتبو) ، (پەندی وام زۆر پێ‌درابو) یان هەرەمەیی بلێین : (قورو چلپاوی وام گەلێ بە قونان هەلپەڕی‌بو) .

**ـ (لە بەندیخــانە لەنێو لاتەکان‌دا بلوم) لاپەڕە (٢٦٠) . لات و شــــەیەکە هەرەمەی خەلکی فارس دەی‌لێن‌و ، بە مانای (شــقاوە)ی عەرەبیــە . لـــە کوردی‌دا بە کەسێکی هــەژارو بێ‌بژیو دەلێن وەك : (ئەوەندە لاتە سەگ کلکی لێ‌دا دەکەوێ) . لە جێگای (لات)ی فارسی ، لە کوردی‌دا دەگوترێ : سەرسەری، چەقاوەسوو ، لاپرەسەن ، لالەوەڕ ، لاسار . لـــە شاربازێر (چەورە)ش دەگوترێ .**

**ـ (بۆ ئەوەی خۆی بنوێنێ ئەم جۆرە دەســـتە گولانە بـــە ئاودا دەدا) لاپەڕە (٢٦٠) . دەبو بگوترێ : (بۆ ئـــەوەی خۆی ڕابنێ ، یان ، بۆ خۆڕانان ئـــەم فروفیشالانە دەکات) یا (ئەم گونگەلانە دەگێرێ) .**

لە کوردی‌دا لەجیاتی (دەستە گول) کە فارسیەو بە ئیملای کوردی نوسراوە ـ چەپکە گول‌و دەسکە گول‌و دەگوترێ . ئـــەوە نیـــە لە کۆتایــی حیکایــەتدا ، حیکایەت بێژ دەلێ : (دەسکێ ، یان ، چەپکێ گول‌و نێرگز مەرگی ئێوە نەبینم هەرگیز) . (دستە گل بـــە آب دادن) کینایەیەکی فارسی‌یە ، وا دیارە ئیشارەیێ بۆ حیکایەتێکی کۆن کە لەبیر چۆتەوەو تەنیا کینایەکە ماوەتەوە . حیکایەتەکــە گوایا ئاوایە : (عـــەباســە ، خوشکی هارونە ڕەشید «..٨ز» وەکو مێژونوسەکان دەلێن‌و لە شــیعری شــاعیرەکان‌دا هاتوە ، نێوانی لەگەل جەعفەری بەرمەکی هەبوە . جۆگەیەك ئاو بە مالی عەباسەدا ڕۆیشتوەو چوە بۆ مالی جەعفـــەر . عەباسە نامەی بو جەعفەر دەنوسی‌و دەینا ناو چەپکێ گول‌و ، لە حەوشەی خۆیانەوە چەپکە گولەکەی بـــە ئاودا دەدا . جەعفەریش لە حەوشەی خویان لە سەر جۆگەکە دەوێستاو چەپکــە گولەکەی دەگرتـــەوە . چلوچۆکەر پێ‌یانزانی‌و بۆ هارونە ڕەشیدیان گێراوە. دەلێن ئەمە بوە هۆی فەوتانی بنەمالەی بەرمەکی) .

ئەمە (ترائژیدیا)یە . ئەرەستۆ دەلێ : ترژیدیا ئەوەیە کە کار پێچەوانەی خۆی لێ‌پەیدابێ . یان بە عەرەبی: (تحول الفعل الی ضـــده) . عەباســـە ئەو کارەی سەباردت بە عیشق‌و خوشەویستی کردوە ، کەچی بۆتە هۆی فەوتانی بنەمالەی بەرمەکی . لەفارسی‌دا ئەو کینایەیە بۆ کارێکی دوستانەو خۆشەویستانەی وا بەکاردەهێنرێ ، کــە ببێتـــە هۆی مەینـــەت‌و چەرمەسەری . جا بەم پێ‌یە وەرگێڕی فارسی لـــە جێی‌خۆی‌دا بەکاری‌نەهێناوە . کاك عەبدوللاش کـــە وەدوای ئەو کەوتوە تووشـــی هەلەکـــەی ئەو بوە . پێویستە ئەوەش بلێین کاتێ ئەم قسـەیە دروستە کەلە تێکستە فارسی‌یەکەدا ئاوا بوبێ .

ـ (دەمم کرایەوەو گوتم «زەکی») لاپەڕە (٢٦٠). (زەکی) لە فارسی‌دا وشـەیەکی سوکە . لە کوردی‌دا لەجیاتێ ئەوە دەلێن : (ترحەو) . نەختێ بە ئەدەبی ترو بە مەجاز دەلێن : (تەڕت نەپێکا !) .

ـ (بەتایبەتی ڕیشی ڕەش‌و **بەپشتی** من ...) لاپەڕە (٢٦٦) ـ (ڕیشەڕەش‌و پڕەکەی من) .

ـ (لێفەو دۆشـــەکەکـــەم لـــە بەندیخانـــە بلاو بکەمـــەوە) لاپەڕە (٢٧٧) ـ (بەهزوانە پێ‌خەفـــەکانم لەبەندیخانە ڕاخەمەوە) .

ـ (دەبێ .. بەقازانجی بورهان دەست‌بەکاربم) لاپەڕە (٢٧٨) ـ (بە قازانجی ، یا بە سودی بورهان بکەومەخۆ ـ بکەومە کار ـ هەول‌بدەم ـ خەریك‌بم).

ـ منیش ڕاست دوچاری ئەو حالە ببوم) لاپەڕە (٢٧٩) ـ منیش هـــەر ئاوام لێقەومابو ـوام بەســـەر هاتبو) .

ـ (نوێنەری ئاغا .. ) لاپەڕە (٢٧٩) ـ (پیاوی ئاغا ـ کوێخای ئاغا ـ گزیری ئاغا) .

ـ (ئەمە چ گوکاری‌یەکە ؟) لاپەڕە (٣٦٢) ـ (ئەم کارە گوواویە چیە ؟) .

ـ (تەباخەکە بـــەجارێك **دەســـت و لاقی خۆی ونکردو زمانی ڕەقبو**)لاپەڕە (٣٦٢) ـ چێشتکەرەکە بە جارێك پەشۆکا) ، (سەری‌لێ‌شێواو زمانی بەسترا، دەمی ڕەق‌بو) .

ـ (لەپێشدا ئەگەر بە تاوانی کلاو لە ســـەرنان دەگیرام هیوایەکی بەربونم‌بو) لاپەڕە (٢٠٩) ـ لەپێشدا کە لەسەر ساختەچیەتی ، کەلەکبازی ، دەست‌بڕی‌و گوێ‌بڕی دەگیرام ..

ـ (دیســـان ڕۆژنامـــەکان **هەنگامەیەکیان**

**بەرپادەکرد)** لاپەڕە (٢٠٩) ـ دیـــان ڕۆژنامـــەکان قولەو هەرایان دناوە ـ بەیتو باویان ڕێك‌دەخـست، لە هەرایان دەدا .

ـ (شالوارێکی مەخمەری کۆنم لەبەردابو ..) لاپەڕە (١١٤) ـ لەپێدابو . بۆ جلکی لای خوارەوەی لەشـ وەکو دەرپێو پانتـۆڵو ڕامک ، لەپێدابـون دەگوترێ . بۆ جلکی لای‌سەرەوە ، یا بۆ دەسـتێك جل ، لەبەردابون دەڵێن ، وەك کەوایـەکی ڕەشـــم لەبەردابو ، یا ڕانكو چۆغەی سورم لەبەردابو .

ـ (بێ‌دەنگ بە **کلاوچی** دز !) لاپەڕە (١٠١) ـ بێ‌دەنگ بە ساختەچی دز ! ، دەغەلی دز ! کلاوچی لەکوردی‌دا نالوێ .

ـ (زۆر باشە برۆ **دەست بەکاربە)** لاپەڕە (٩٥) ـ بچۆرە سەرکار ، بچۆ کاربکە ، برۆ خەریکی کاربە.

ـ (دوکەڵ لە کەلە سەرم هاتەدەر ..) لاپەڕە (٧٨) . لە کوردی‌دا ئەمە ناگوترێ ـ ئەقل لە کەللەمدا نەما ، واقم وڕما ، لەدین دەرچوم .

ـ (ئەوەندە **دەستەپاچە** بوم ..) لاپەڕە (١٢٩) ـ ئەوەندە تێك‌چوم، ئەوەندە پەشۆکام، بە جۆرێکی‌وا سەرم‌لێ‌شێوا .

ـ (بەتانی خۆم **لێ‌بلاوکردەوە)** لاپەڕە (٢١٠) ـ بەتانی خۆم لێ‌ڕاخستەوە .

ـ (ئەسپەکان بەغار بەرەو کوێستان دەڕۆشتن) لاپەڕە (٢٢٥) ـ ئەسپەکان بەرەو چیا ، بەرەو کەژ ، بەرەو کۆسار (هەورامی) کەوتنـە غار . ووشـەی (کوهستان) لە فارسی‌دا یانی جێگای شـاخاوی . چونکە لە دو کەرتی (کوە) بە مانای چیاو (ستان) بـە مانای جێگا تێکخراوە . بەلام (کوێستان) یاوەك لـە ناوچـەی سنەو شارەزور دەڵێن (کێوسان) لـە کوردی‌دا بە مانای جێگای سـاردە ، وەك دەڵێن : (گەرمێن‌و کوێستان دەکا) . یا وەك لە گۆرانی‌دا هاتوە : (کوێستانانان خاڵ خاڵ بەفری ناچێتۆ ـ یارم تۆریاگە ئاشتی نابێتۆ) .

ـ (هاوڕێ‌کەت ئازادبو) لاپەڕە (٢١٥) ـ (هاوڕێ) بۆتە زاراوەیەکی سیاسی . وا باشتر بو بگوترێ : هاو هۆدەکـەت ، هاودەنگـەکـەت ، برادەرەکەت .

**ئەمانەش هێندێ لەو ووشـەو کینایـەو مەجازانەی کە ووشـە بە ووشـە لە تێکستە فارسیەکەوە کراونەتە کوردی‌و ، لە زمانی ئـەدەبی کوردی‌دا جوان‌نین . وەلەبـەر چوار مەبەسـت بەتایبەتی پەنجەم خستە سەر ئەمانە : یەکەم جوانی وەرگێرانەکە دەشێوێنن . دوەم لـە گـەرمێن تێ‌یان ناگەن . سێ‌یەم لە جیاتی ئەوانە ووشـەو زاراوەو کینایەی ڕەسەنی کوردی هەن‌و ئەگەرئەمانەو هی وەك ئەمانە لە نووسین‌دا ببنە باو ، هینەکانی خۆمان لـە بیر دەچنەوەو زیانێکی قورسمان لێ‌دەکەوێ . چوارەم بەشکەم وردبونەوەو لێکۆلینەوەی ووشـەکان لە ناو قەلەم بەدەستەکانمان‌دا ببێتە باو ، ووشەی جوان و ڕەسـەن لە هی چەوتو چـەوێڵ‌و نادروسـت هەلاوێردرێ . چونکە بەردی‌بناغەی شتی ئەدەبی ، هێنانی وشەی دروستو ڕەسەن‌و جوانە. هەرشتێك بە ووشەی نادروست، یان چەوتو چەوێل بنووسرێ، با بـە ناوی زێڕو تـەلاش بێ بە شـتێکی ئەدەبی ناژمێردرێ . یان بەلانی کەمەوە بە شـتێکی ئەدەبی دزێوو ناڕەسەن وەردەگیرێ .**

لەمەپێش گوتمان (تێکستە کوردیەکە بە چەشنی گشتی کە دی‌یالێکتیش بکرێتەوە) . مەبەست ئەوەیە وەرگێرانەکـە هێندێ شێوەی دی‌یالێکتو ناوچـەیی پێوەدیارە . یەکێ لەوانە (ی)ی زیادیە ، بۆ نمونە : (ئاردقێکی ســاردم بە **لەشی‌دا** هات) لاپەڕە ١٢٦ ، (ئێستا ئەو **کەرەی** لەو **قوڕەی** وەپەرێنە) لاپەڕە ٢٠٩، (ڕێگا **لەوەی** باشتر نابێ) لاپەڕە ٢٩١ ، (هێندێك کار لە پێش چاوی پیاوی زۆر هاسانن) لاپەڕە ٩٠ .

(ی)ی (لەشی) ، (ئەو کەرەی) ، (لەو قوڕەی) ، (لەوەی) ، (پیاوی) و هی‌تری وەك ئەمانە لە ڕۆژگاری کۆن‌دا دەبێ ئەرکێکیان بەجێ‌گەیاندبێ‌و کەلکێکیان هەبوبێ . بەلام تێ‌پەڕبونی ڕۆژگارو (تطـور)ی زمان لە کەلکی خستون‌و ئێستا لە زمانی ئەدبی‌دا بونەتە زیادی . پێویستە ئەوەش وەبیر بخەینەوە کە ئەمە لە ئەمڕۆکـەدا ، کـە زمانی ئەدەبیمان هێشتـا شوێنەواری دیالێکتو (لهجە)کانی زۆر پێوەماوە بە هەلە ناژمێردرێ‌و ، تەنیا دەتوانین تۆزێ بە ناڕەوانو نافەسیحی دانێین .

لە وەرگێرانی تەواوباش‌دا ، ئەگەر لە تێکستە ئەسلیەکەدا توشی زاراوە یان ئیشارە بۆ بەسەرهاتو

حیکایەت‌و شتێکی وا هاتین کە لـە زمانی کوردی‌دا نیەو نەناسراوە ، دەبێ ئەو زاراوەو ئیشارەبە بهێنین‌و لە داوێنی لاپەڕەکەدا ڕونی‌کەینـەوە . وەك : (هیچ لوتی‌یەك سەلوجی ڕەت ناکاتەوە) کە کاك عەبدوللا لە لاپەڕەی (٢٨٢)دا هێناویەتی .

لوتی لە کوردی‌دا بەو کەسانە دەڵێن کە تا پێش شەڕی دوەمی جیهانیش بە دێهاتەوە دەگەڕان‌و ، بە دەهوڵ‌و زوڕناوە ورچ‌و مەیموونیان هەڵدەپەڕاند . بە مەجاز بە ئینسـانی بێعاریش دەڵێن . لـە زمانی هەڕەمەی فارسی‌دا بە مانای (أبو جاسم)ی عەرەبی بەکاردەهێنرێ . لەو وتەیەی سەرەوەدا لە جیـاتی (رند ـ ڕێ‌یەکە ژێری هەیە) بەکارهاتوە کە لە ئەدەبی فارسی‌دا بـە مانای بێ‌باکو (لاابالی‌و لاقید)ە . یانی ئەو کەسەی بەڕواڵەت بۆ لۆمە دەشێ ، بەڵام لەدڵ‌و دەرونی خۆی‌دا پاك‌و بێ‌خەوشە . لە سۆفیکەری‌دا بە مانای وەشوێن کەوتنی (حق‌و حقیقە)و گوێ‌نەدان بە ڕواڵەت‌و (تقلیـد)ە . (حافظ) ئەم ووشەیە زۆر بەکاردەهێنێ . وەك : (مرا روز ازل کاری بەجز رندی نفر مودند) یانی ڕۆژی ئەزەل لـە ڕینـدی بەو لاوە کارێکیان بەمن نەسپارد . لە کوردی‌دا (ڕەند) بـە مانای جوان‌و جوامێرە . دەڵێن (کیژێکی ڕەنـدە) یانی جوان‌و شۆخە ، (پیاوێکی ڕەندە) یانی جوامێرە. بە مانای زدوی بەیاریش هاتوە . (صبوحی) پیالەیەك شەرابە ، ئەوانـەی شەو سـەرخۆش‌بون بەیانـی خواردویانەتەوە . ئەمـە لـە شیعری حافزدا زۆر هاتوە. وەك : (گر فوت شد سحور چە نقصان صبوح ـ از می کنند روزە گشا طالبان یار) یانی با پارشێویش لە کیس چوبێ قەی ناکا ، سەبوحی ماوە . ئەوانەی داواکاری‌یارن ڕۆژو بە شەراب دەشـکێنن . لێرەدا ئیشـارە بۆ مانای شەرابو ڕۆژو یار لـە باری سوفیکەریەوە دەکاو دەڵێ : ئەوانەی دەیانەوێ بگەنە دیداری (مراد) با تاعەتی نیوەشەویشیان لە کیس چوبێ قەی ناکا ، بەیانیان لە (پیرودەزگیر) کە داواکاران ڕێنوێنی دەکا ، پیتو بەرەکەت وەردەگرن‌و بە هۆی ئەوەوە دەگەنە (مراد) .

هەروەها هێندێ وشەی کەم ناسراویش وەك : (تانـە) لاپەڕە (١٨٤) ، (وچخـان) لاپەڕە (٢٢٨) ، (بەزیوان) لاپەڕە (٣٥٦) ، (گرۆ) لاپەڕە (٢٤٤)و هی‌تر ▷

لەناوبەرەی نەخوێندەواری

نەویستنی زۆرداری‌و

لەتلەتبوون‌و

چەوساندنەوەیە

.. دەبو لە داوێنی لاپەڕەکان‌دا مانایان بنوو سرێ .

**دەڵێم لـە داوێنی لاپەڕەکان‌دا بنووسـرایە . چونکە من لەگەڵ ئەوە نیم کـە لە کۆتایی کتێبان‌دا وشەنامە دەنوسن . ئەم کارە سـەر لە خوێنـەر دەشێوێنێ‌و ناچاری دەکا هەرجارێك توشی وشەیەکی نەناسـراو هات لە وشەنامەکـەدا بۆی بگـەڕێ‌و بیدۆزێتـەوەو مانای بزانێ‌و بگەڕێتـەوە سـەر خوێنـدنەوەکـەی . لەم هاتوچۆیـەدا هـەودای مەبەستەکە لە زەینی‌دا دەپسێ . کە چەند جار پەیتا پەیتا توشی ئەم گێرەو کێشـەیە هات وەڕەز دەبێ‌و کتێبەکە فڕێ‌دەداتە ئەو لاوە . بەڵام کە لـە داوێنی لاپەڕەکەدا مانای ئینجا بێتەوە گورج تەماشای دەکات‌و دەڕوا بەرێی خۆیەوە .**

ئەمە چەند مەبەسـتێك بوو لە کتێبی (گێلـە پیاو دا کە کاك عەبدوللا حـەسـەن زادە لە زمانی فارسی‌یەوە کردویەتە کوردی وەبەرچاوم‌کەوت . بە ڕاشکاویەکی تەواویشـەوە دەڵێم ئەم سـەرنجانە لـە نرخی کاردکەی ئەو کەم‌ناکەنەوەو بـە کتێبێکی (٣٨٠) لاپەڕەییەوە دیارنین . وە وەرگێڕانەکەی بە یەکێ لە وەرگێڕانە هەرەباشـەکانی تا ئێستا لە زمانی کوردی‌دا دەزانم‌و پیرۆزبایی لێ‌ددکەم لە سـەرکاری وەرگێڕان کە کارێکی زۆر پێویسـت‌و بەنرخەو ئەویش زۆر باشی لەدەسـتدێ شێلگیربێ .

١ ـ شاعیری ئینگلیس (١٥٩٢ ـ ١٥٦٤)



کامەران هەر لە سەرەتای پەیدابوونیەوە لە گەڵ ئەو هەموو تەئسیرانەی لەسەری‌بوو ـ لە چەند هەوڵدانێکی شیعری باش خاڵی نەبوو ، ئەم باشیەشی زیاتر وەك پڕکردنەوەی بۆشاییەکی بیری نەتەوایەتی نەوەك تەکنیکی شیعری لە چوارچێوەی شیعری نوێ‌دابوو . بۆیە کامەران لە چاو ئەو شاعیرە نەتەوایەتیانەی کە لەم سەردەمەدا

# چەند سەرەتایەکی نوێ لە شیعری کوردیدا

**گوشاد محمد سعید**



هەبوون وەك ـ عوسمان عوزێری‌و کامیل‌ژیرو لە سەردەمی خۆی‌و بێکەس‌یش پێشکەوتووبوو .. گەر سەیری شیعرەکانی هەموویان بکەین بە روونی بۆمان بەدیاردەکەوێ کە کامەران وەك شاعیرێکی لاو لەو سەردەمەدا زۆر بەهێزتر لە هەموویان هاتەکایەوەو، شێوەی نووسینەکەشی لە هەموویان بەهێزتربوو .

هەرچەندە ـ بێکەس ـ گەلێ شیعری بەهێزی هەبوو بەڵام شێوەی نووسینی ئەم شێودیە نیە کە کامەران پێی نووسیوە .. بەتایبەتی لە مەسەلەی ـتقطیعـی شیعری‌دا هەرچەندە ـ گۆران ـ بۆ یەکەمجار ئەم شتانەی کردوە بەڵام کامەرانیش چەند هەوڵێکی باشی تێداهەیە کە رێگەشی زیاتر بۆ نووسینی شیعری ـ ئازاد ـ خۆشکرد .

لە لایەکی ترەوە کامەران زیاتر هێزی شیعرو شاعیریەتی تێدابووە بەتایبەتی لە چوارچێودی ئەم شێوە نوێیەی کێشی پەنجەی کوردی .. زۆریش داهێنەرانەتر لەم شاعیرە نەتەوایەتیانە هاتە ناوجیهانی شیعرەوە .. دەشتوانین بۆ ئەم قسەیەمان چاو بە دوا دیوانی ـ کامیل‌ژیر ـ کە دیوانی ـکوردایەتی‌یە بکێڕین‌و لەگەڵ یەکەم دیوانی کامەران کە ـدیاری‌یە بەراوردبکەین کە کامەران ئەم دیوانەی لە ساڵی ـ ١٩٥٧ ـ چاپکردوە لەگەڵ ئەوەی ـ کامیل ـ دیوانەکەی لە ساڵی ـ١٩٦٠ـدا چاپکردوە .. دبینین کە کامەران زۆر شتی لە ـ ژیر ـ جوانتری هەیە ، هەرچەندە ژیر تاقیکردنەوەیەکی دوورو درێژیشی لە شیعردا هەبووە .

بەڕاستی هاتنەکایەوەی کامەران لە کاتو ساتێکی ئاوادا کە ناوەڕاستی پەنجاکانە .. شتێکی رێککەوت نەبوو ، بەڵکو وەك پێویستیەك بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشایەی لە شیعری نەتەوایەتی‌دا هەبوو یاخود ئەم گەرمو گوڕیەی کە ئەوسا هەبوو هاتە کایەوە (وەش نەبێ شاعیری نەتەوایەتیمان کەمبووبێ .. نەخێر بەڵکو شاعیرمان بەڕادەیەك زۆربووە کە جێی سەربەرزی‌و مایەی شانازیی نەتەوەکەمانن وەك خانی‌و کۆیی‌و بێکەس)و(١) ، لەسەردەم‌و هاوتەمەنی کامەرانیش‌دا هەمانبووە ، بەڵام لە چوارچێودی ئەو شێوە نوێیەی لەسەردەمی گۆڕانەوە چەسپاو ئەم گۆڕانانەش کە بەسەر بیری نەتەوایەتی‌دا هاتن‌و ئەو تەوژمە شۆڕشگێڕیەش کە لەم بارەوە هەبوو .. لەناو ئەم هەموو شتانە کامەران وەك دیاردەیەکی بەهێز پەیدابوو .. دەورێکی باشیشی لەو (واقیعیەتە شۆڕشگێڕیەی)دا بینی کە شیعری تێدا دەنووسی .. هەرچەندە لەم سەردەمانەدا هەوڵدەدرا کە پرۆپاگەندە بۆ چەند شاعیرێك بکرێ‌و گەورەش بکرێ وەك ئەم شتانەی بۆ ـ ژیر ـ کرا .. بەڵام بێ‌گومان سەری‌نەگرت .. ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کە ژیر خۆی شتێکی وای تێدا بەستەنەبوو بۆ ئەوەی وەك شاعیرێکی گەورەی نەتەوایەتی بە خەڵکەکە بناسرێت . (دووەم ئەو پاڵپشتە فیکریەی کە دەیویست گەوردی‌بکات شتێکی وانەبوو)(٢) هەر ئەمەش‌بوو کە بووە هۆی ئەم بگرەو بەردەی نێوان کاك (محمدی‌ملاکریم)و (جەماڵ نەبەز) ، ئەمە لە لایەکەوە ، لەلایەکی ترەوە هاتنی کامەران (هەرچەندە نامانەوێ باسی ئەو کاریگەرانە دووبارە بکەینەوە کە کامەران لە بەردەمیا بوو) بەڵام ئەگەر کامەران لەگەڵ ئەم شاعیرانەدا بەراوردبکەین دەبینین شێوەی نووسین‌و ئوسلووبی تایبەتی خۆی کە شیعری پێ‌دەنووسی زۆر لەهی ئەوان نوێتربوو ، هەروەها مەسەلەی بیرکردنەوە نەتەوایەتیەکەشی پێشکەوتنخوازانەتربوو ، ژیر ـ (بیرکردنەوە نەتەوایەتیەکەی بە ئاینەوە دەبەستێتەوەو هەموو بیرو باوەڕێکی پێشکەوتنخوازانەش ددنێتە لاوە)(٣) ، بەڵام هەرچی کامەران‌بوو لە بیروباوەڕێکی پێشکەوتنخوازانەوە مەسەلەکەی خۆی بە هەموو مەسەلە مرۆڤایەتیەکانەوە دەبەست .. ئەمەش زیاتر پەیوندی‌یەکی جەدەلی لەنێواندا هەیە .. دەتوانم بڵێم کامەران لەسەردەمی خۆی‌دا لە شێوەی نووسینی خۆی‌دا ـ حەماسی ـ ترین شاعیرە لەزۆر کاتیش‌دا لەم شیعرانەدا لە شیعرەکانی تری سەرکەوتووترە ـ. ودك لە پێشەوە باسمانکرد ـ بەڵام ئەو ئاگری حەماسەتەی لە شیعری کامەران‌دا هەیە لە شیعری شاعیرەکانی تردا کە باسمانکردن کوژاوەتەوە ، بێکەس نەبێ کە چەند شیعرێکی بەهێزی لەم بارەیەوە هەیە .

با لێرەدا بگەڕێینەوە سەر مەسەلەی ـ شیعری ئازادـو لەسەر چەند بنچینەیەکی راستی مێژوویی بەدوای‌دا بچین . تا ئێرە لێمان روونە کە کامەران (بۆ یەکەم جار کێشی شیعری کوردی‌ی نەشکاندوە) بەڵام با بزانین ئەو کەسانە کێن کە ئەم کێش‌و سەروایان شکاندوەو وەك شیعری ئازادیش بێتە بەرچاو ؟

بێ‌گومان ـ دیلان ـ یەکێك‌بووە لەو شاعیرانەی کە لە بەردەمی کامەران‌و پێش‌و پاش ئەویش شتی نووسیوەو شاعیرێکیش بووە

هیچی له کامەران کەمتر نەبووه . ڕاستیەکی مێژوویش هەیە کە لای ئەم شاعیرە چنگدەکەوێ کەچی تاکو ئێستا بەردێکی بەسەردانروه . کاك کامیل بەسیر دەڵێ (کامەران لە ساڵی ١٩٥٤ بەولاوه دەستی‌کردوه بە نووسینی شیعر)(٤) بۆ یەکەم جاریش کامەران دوو شیعری لەگەڵ چەند شیعرێکی هەژاردا لەچاپداوه دووەم جاریش دوو شیعری لە نامیلکەیەکی بچووکدا چاپکردوه . ئەمە تا ساڵی ١٩٥٦ دێت کە شیعری ـئازادی نیه کە باشترین شیعری لەم ماوەیە شیعری (کچی نەغەدەیە)(٥) ئەم هەوڵەی تێدا نابینرێ . بەلام ئەوەی کە تا ئێستا لە بارەی شیعری ئازادەوه بە بەرچنگم کەوتوه شیعرێکی ـدیلانە ، بۆیە تا ئێرە دیلان بەیەکەم‌کەس دادەنێم کە شیعری ـئازادی نووسیبێ . نەك هەر لە شکاندنی کێش‌و سەروا بەلکو هەتاوەکو ئیحساسی شیعریش وەك شیعرێکی جوان دێتەبەرچاو ئەمەش شیعری (ـرێگەی خەباتـە کە ـ دیلان ـ لە ساڵی ١٩٥٤دا نووسیویەتی)(٦) کە لە ژێرناوی شیعری موتلەقدا نووسیویەتی . دیلان نەك هەر لەم شیعرە بەلکو هەر لە سەرەتاوه دەربارەی هەردوو جۆری شیعری ـ ئازاد ـ و ـکلاسیـیش پێشکەوتنێکی باشی پێوەدەبینرێت. ئەگەر سەرنجێك بدەینە دیلان دەبینین هەر لە جولانەوەو بەرەوپێشەوەچووندایەو لە چاو ئەو سەردەمەی کە ئەوی تێدا هاتۆتە کایەوه زۆر زیندووانە شت دەخاتەڕوو کە لە کاتێکدا ئەو شاعیرانەی کە هاوسەردەمی ئەون لەم سەردەمەدا تێکڕایان بزربوون بۆیە گەر بە تەرازووی مردن‌و زیندوویەتی ئەدەب (ئەو شیعرانەی دیلان بکێشین ئەبینین شیعرەکانی لە تای تەرازوودا بەرامبەر سەنگەکە ئەوەستن)(٧) ئەمەیان لە شیعرنووسینا بەگشتی ... بەلام وەك شیعری ئازادیش دیلان وەك شتی چاپکراو یەکەم شیعری (ئازادی) نووسیوەو بە شیعرێکی پەخشانی لەقەڵەمداوه .. بەلام لە ڕاستیدا نەك هەروەکو شیعرێکی ئازاد لەناو شیعری کوردی‌دا بەلکوو هەروەکوو شیعرو لایەنە هونەریەکانیش شتێکی نایابەو بە روانگەی ئەو کاتە وەك چلەپۆپەی شیعری ئازادو وەك ئێستاش شیعرێکی ئازاد هەموو خاسیەتێکی شیعری نوێی تێدایە .. چونکە گەر بەراوردێك لەگەڵ شیعرە ئازادەکانی پاش خۆی بکەین دەبینین ئێستا بەلای شیعرەکەی ـدیلانـدایە . هەروەها ئەمە هەر بەتەنیا ئەوە نیەو ببڕێتەوه بەڵکوو شتی تریشی بەدوادا هاتووە وەك شیعری (نێرگس‌و لۆمۆمباو بۆ گیانی غەنی بلووریان‌و درەخت‌و شاری تازەو وەڵام تا سۆروداخ)(٨) .. دەبا لێرەدا چەند نموونەیەکی شیعری بۆ خوێنەران بهێنینەوەو هەستیش بەم داهێنانە نوێیانە بکەن کە دیلان بەتایبەتی لە شیعری ئازاددا کردویەتی :

له شیعری ـ رێگەی خەباتـدا ئەوەمان بۆ بە تەواوەتی ، دەردەکەوێ .

تێکڕای ئەم شتانە ئەوە روون‌دەکاتەوە کە دیلان زۆر بە گەرمیەوە هاتە مەیدان‌و ئەگەر ئەم شیعرە ئازادانە لەگەڵ شیعرە ئازادەکانی کامەراندا بەراوردبکەین [بەتایبەتی شیعری (دووبەرەکی) کە بەڕای‌من لە هەموو شیعرە ئازدەکانی کامەران بەهێزترە] دەبینین کە شیعرەکانی دیلان بەهێزترەو خاسیەتی شیعری ئازادی زیاتر تێدا دێتەدی بەتایبەتی لەلایەنی تەکنیکی شیعری‌یەوه ، کەچی (دیلان ـ لەکاتی خۆی‌دا ـ رێگای خەباتی ـ بە پارچە شیعرێکی پەخشان ناونابوو ، نازانم بۆچی ؟ کە لام‌وایە شیعرێکی گەلێ بەرزە)(٩) .

هەرچەندە کامەران لەکاتی خۆی‌دا گەلێ پێشنیازی بۆ شیعری ئازاد کردوەو ئەم شێوە شیعریە تازەشی لا پەسندبووه ، بەلام داخەکەم توانای نەبووه خۆی‌ لێبدات لەپێشەکی دیوانەکەی شێخ نوری‌دا دەڵێ : (لە کاتێکا کە هۆنراوەی کوردی لە کۆتی (شێوەو هەستی کۆنا) بوو ، شێخ نوری‌و گۆران شۆڕشێکی قووڵیان لە هۆنراوەی کوردی‌دا بەرپاکرد ، ئەگەرچی زۆر کەسێش ئەم شۆڕشەی بەلاوه (باخیبوونێکی نارەوابوو) دەربارەی هۆنراوەی کوردی ، بەلام لە ئەنجامدا بەتایبەتی لەم ساڵانەی دوایدا دەرکەوت کە شۆڕشێك بوو پڕ بەپڕی واقیع‌و پێویستی)(١٠) . بەلام خۆزیا کامەرانیش وەك ئەوان دووبارە شتێکی کردبا . هەرچەندە ـ دیلان ـ پێشی ئەو شتەی‌کرد بەلام هەوڵەکانی کامەران هیچ شتێکی نوێی لەدوای ئەو نەهێنایەکایەوه . هەرچی دیلان بوو لەژێر ناوی ـ شیعری پەخشانـدا

ئـەو شـتـەی‌کرد چونکە باسـایە شیعریەکـەی ئـەو سـەردەم وای دەسەپاند کەچی چەند سال بەسەر ئەم سـەردەمەدا تێپەڕی بوو ئینجا کامەران ووتوبەتی (ئەبێ سنووری هەبێ بۆ هۆنراوە بۆ ئەوەی لـە پەخشان جیابکرێتـەوە ، چونکـە ئەگەر هاتو ئەو سنوورە نەما ئەوا ئەم دوو بەشەی وێژە تێکەڵ ئەبن‌و لەیەك جیاناکرێنەوە ئەو سنوورەش تەنیا کێشە)(١١) .. دیسان دەڵێ (کێش ئـەگـەرچی بنچینـەی هۆنراوەیە بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا مەرجنیـە وەك چۆن بووە هەروابێ ئەگونجێ کێش پارچە پارچە بکرێ لە چەند شوێنێکا چەند پارچـە لابرێ‌و لە چەند شوێنێکا چەنـد پارچەیەکی بلدرێتە دەم ، بەڵام ئەم کارە ئـەبێ بـەهۆی وونبـوونـی بنچینەی کێشـەکە چونکە ئـەگەر هاتو وای لێ‌بەسەرهات ئەبێ بـە پەخشان)(١٢) بـەڵام لـە کاتێك‌دا کامەران ئەم قسـەیەی کردوە لـە مێـژوەوە دیـلان بـەکـردەوە جێ‌بەجێ‌ی‌کردوە ئەم شیعرانـەش کـە باسمان‌کردن هیچیـان ئـەم بنچینـانـەی بـزرنـەکردوە .. بـەردەوام‌بوونی دیلانیش لەسـەر شیعرو ئەم هەنگاوانـەش کـە نای مانایەکی گـەورەتر دەبەخشێ . بۆیە من تائیرە دەڵێم دیلان یەکەمین کـەسێك بووە وەك شـاعیرێك ـ شـیعری ئازادی بـەشێوەو پێکهاتن‌و ئیحسـاسـاتێکی نوێ‌وە نووسیبێ‌و ، ئـەوەشمان لەبیرنەچێ کاتێك سـەردەمێکی زۆربوو کـە کامەران لە شیعرنووسین وەستابوو کـەچی تازە ـ دیلان ـ شـیعری ناسکی وەك شـیعری (بەسـتەی بێ‌دەردتان)(١٣) دەخاتـەروو .

مارف‌خەزنەدار دەربارەی یـەکـەم شـیعری ئازاد کـە لـە دیوانـە یەکەمەکەی‌دا واتە (شێخ مەحمودی زینـدوو) دەڵێ : (ڕێگای خـەبات نموونەیـەکی جوانـە بۆ شـیعری ئێستای کوردی .. وە اسلوبێکی تازە لـەپێـش ئـەدەبی کوردی ئـەکاتـەوە)(١٤) ئـەمەش ئـەوە روون‌دەکاتەوە کە لەم سـەردەمەدا یەکەم شتێك‌بووە (د . مارف) ئاوا بە سەرسورمانـەوە لێ‌ی‌بدوێ .. هەرچەندە (گۆران) لە ساڵی ١٩٥٢ لە ڕۆژنامـەی ـژین‌ـدا شیعرێکی ئازادی هەیە بـە ناوی (چـەنەڵ) ئـەمـە دوبارە لـە جێگای خۆی لێ‌ی‌دەدوێین .

سەیری ئەم سەرچاوانە بکە :

١ ـ کوردایەتی ـ کامل ژیر ـ ١٩٦٠ ـ ل٧

٢ ـ کاك محمدملاکریم لە ساڵی (١٩٦١)دا نامیلکەیەکی لـەژێرناوی کوردایـەتی کامل ژیـر لـە ژێـر نەشتەری‌بەکاڵا کردنـەوەدا ، ئـەم مەسـەلەی باسکردوە .

٣ ـ کوردایەتی ـ کامل‌ژیـر ـ ١٩٦٠ ـ ل٢٢

٤ ـ کامران شاعر من کردستان ـ ١٩٦٠ ـ باسی ئەم شـتە بـە درێژی کراوە .

٥ ـ دوو شیعری کامەرانە لـە ساڵی ١٩٥٦ چاپکراوە ـ ل١ـ٢

٦ ـ شێخ مەحمودی زینـدوو ـ ١٩٥٨ ـ چاپخانەی تەمەدون ـ ل٣١



٧ ـ شێخ مـەحمودی زیندوو ـ ١٩٥٨ ـ چاپخانەی تەمەدون ـ ل٧

٨ ـ دیلان ـ چاپخانەی ئەسعد ـ ١٩٦٩ ـ ل١٠١ ، ١٠٦ ، ١١٧ ، ١٣٧

٩ ـ شێخ مەحمـودی زیندوو ـ ١٩٥٨ ـ دیلان ـ ل١١

١٠ ـ دیوانی شێخ نوری سالح ـ چاپخانەی کامەران ـ ١٩٥٨ ل٣

١١ ـ خۆشـەویسـت ـ ئەرخەوان ـ ١٩٦٠ ـ ل٥

١٢ ـ خۆشـەویسـت ـ ئەرخەوان ـ ١٩٦٠ ـ ل٥ـ٦

١٣ ـ هـەڵبژاردە لـەدیوانی گـۆڤاری ڕۆژی کوردسـتان ـ ١٩٧٧ ـ ل٩٨

١٤ ـ شێخ مەحمودی زیندوو ـ ١٩٥٨ ـ ل١٢





ـدوهەر كرمانج

نەکەی برۆی
ئاگردانی شەوانم لێ بکوژێنیەوە
نەکەی بەتەنیام جێبێلی
ماندووبوونی بێوچانم بتوێنیەوە
نا .. نا .. نەکەی
کەسێ نیە ،
بتوانێ بە تەنیا بژی
مانگیش بۆ عاشقی تر ە
داوێنی ئاسمان دەگرێت و .
رووناکایی خۆی دەکوژی

● ●

نەتدەزانی کەزیز دەبیت
چی درەختی جێ ئوانـە
لقو چلیان دەپێچنەوە .. ؟
باڵداریش رێ بەدی ناکەن
بخزێنەوە سەر هێلانە .. ؟
پێم نەوتی کە تۆ دەڕۆی
خۆر پێلوی دا ئەداتـەوە
زەوی ، شەو بزری دەکاو
گەڕەکەکان ..
وشکە خەو دەیانباتەوە ؟!

● ●

تەنیا دەستێکم بتگاتێ
ئەمجارەیان .. وا ناکەم دەستت لێم بەردەی
دەتپارێزم ، لـە کرێوە
بەس ئەمجارە بگەڕێوە
ناهێڵم مردن بتگاتێ
بەس ئەمجارە بگەڕێوە !

# جوانترین دێ

گوندێکی بچکۆلە لە ترووپکی چیایەکی بەرکەشدا شینایی ئاسمانی ماچ دەکردو هەموو ئەستێرە جریوەدارەکانی لە بنی کانییە روونو ڕەوانەکانیدا کۆ ئەبۆوەو هەمیشە بۆ خۆر پێدەکەنی دانیشتوانی ئاوایییەکە .. گەورەو بچووک دڵی بچکۆلەکەیانیان خۆشدەویستو بایەخیان بە جوانیو ڕازاندنەوەی دەداو داری بەرداریان دەچاندو نەیانئەهێشت تەس گوڵی باخچەکانی بڕنێ

ڕۆژێ لە ڕۆژان ئازاد لە قوتابخانە گەڕایەوەو پاش نانخواردن دەستی کرد بە خوێندنەوەی دەرزو ئامادەکردنی ئەو ئەرکانەی کە مامۆستا پێی سپاردبوو .. دوای ئەوسا قۆڵی لێ هەڵماڵی ئەوە ئەوەندە ماندێ لە بنجە گوڵەکانی باخچەکەی خۆشەکەیان ...

پەرەسێلکەیەک لە سووچێکی بەرزی ژوورەکەیاندا هێلانەی کردبوو بانگی لێ کرد :

ــ ئەری ئازاد گیان چی دەکەی ... ؟

ئازاد وتی :

+ ئەم گوڵانە ئاو ئەدەم

پەرەسێلکەکە وتی :

ــ ئازاد گیان خۆت ماندوومەکە .. هاکا زستان هاتو لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا گوڵێکی گەش بە پێوە نامێنێو بەفریش سەرانەری ئەم دێیە دادەپۆشێو ڕەشەباش کە وەک ئەو چەقۆیەی مانگا نەخۆشەکەتان پێ سەربڕی تیژەو تاوەکو داریش گەوڵ دەکا .. دەورووژێو پەلامارتان دەدا ..

ئازاد لە پەرەسێلکەکەی پرسی :

+ ئەی پەرەسێلکە نازدارەکە تۆ چۆن فریای خۆت دەکەوی و چی دەکەی ... !

پەرەسێلکەکە وەڵامی دایەوەو وتی :

ــ من ئەم گوندە بەجێ دێڵمو کۆچ دەکەم بۆ وڵاتێکی فێنک ... نە بەفری لێ دەبارێو نە ڕەشەباشی تیا دەخرۆشێ ...

ئازاد پرسی :

+ جا چۆن دڵت دێ هێلانەیەک بەجێ بێڵی کە لە دروستکردنیدا گەلێ ماندوێتیو شەو نخوونیت کێشاوە ... بۆچی لە بیرت نیە لە پێناوی دۆزینەوەی تۆزقاڵێ قوڕدا بۆ تەواو کردنی هێلانەکەت چەندین سەعات دەفڕیتو ئێرەو ئەوێت دەپشکنی ... ؟

پەرەسێلکەکە وتی :

ــ جا چیە ... دەڕۆم بۆ وڵاتێکی فێنکو لەوێ هێلانەیەکی گەلێ لەم هێلانەیە گەورەتر ساز



# چیرۆك بۆ منداڵان

## لەتیف هەڵمەت

دەکەم ...

ئازاد لێی پرسی :

+ ئەی بەچکەکانیشمان لەگەڵتا دێن ... ؟

— بەرەسێلکەکە وتی :

— بەڵێ ئازاد گیان ... ئەی تۆ نازانی ئەوە لـە گەڵماندا بن ... !

دەڕۆین بۆ وڵاتێکی فێنك ... لەوێ بـە بۆن و بەرامەی بێستان و رەزو گوڵـ رەنگاو رەنگـەکان مەسـت دەبیـن و دەحەسـێینەوەو تام و لـە زەتی ئاوەزیوبنەکان دڵت دەکەشێنێتەوە لەم سـەرمایەی گوندەکەتان کە ئەوەندە تیـژە داربێشی ... دەکات رزگارت دەبی ... گیانە تۆ مناڵێکی بچکولانەی ... لەشت لاوازەو بەرگەی سەرماو سـوڵ ناگری ... وەرە لە گەڵماندا میوەی ئێلکا گەشە کاتێ بۆ دەڕۆین و بە پەڕو تووکی خۆمان نوێنێکی نـەرم و شمڵت بۆ دروست دەکەین و فێری فڕین و مەلـەی ناو دەریات دەکـەین ... ئازاد گیـان تۆ تا ئێستا دەریات دیوە ... ؟ دەریا زۆر گەورەیەو شەپۆلە شینەکانی گەلێ گەلێ لە کانیەکانی ئەم دێ بچکۆلەیە جوانترو گەورەترشـە کانی وشك دەکا ... بەڵام دەریا هەتا هەتایە هەر دەمێنێ ... !

ئازاد وەڵامی دایەوەو وتی :

— لە گوندەکەم لە [illegible] کانیەبە بچکۆلەکان [illegible] گەورەتر [illegible] بچکەکان بۆ هەر [illegible] بەڵام [illegible] هەر لەم گوندەدا [illegible] ئەو باڵندانە [illegible] دار دەگرن ... [illegible] هەموو [illegible] لەو تەکەی ئەم [illegible]

[illegible] ئازاد [illegible] ... ئازاد [illegible] بەسەرکی [illegible] وتی :

[illegible] زستان بمانپارێزی ...

# خەرمان

دلشاد عمر کاکی

کچێ خەرمان :
لە بیرتە تۆومان ئەوەشان ..
هەر ئەو ڕۆژەش
چاوەکانت ...
تۆویان لەناو خۆشەویستی منا وەشان .

● ●

کچێ چاوو جوان :
تەزووی ترسی ئەو عەشقە بوو ..
وای لێ کردم ..
باوکت بە تیلەی چاوانی

نیگاکانی شەن نەکردم
کە نیگاکانم شەن کرا
هەستێ لە ناو مشتێ دلا
بە هێلی دوای گاجوتەکا ... چوو بە کا .

● ●

کچێ وەرە ....
تۆ ئاوازێکی پیرۆزی ..
بەکڵدانی ئاسمانی ئەم شەوە گێژە
بەقەترانی ئەو عەشقەی لە دلما سووتا
دوو چاوی شینت برێژە .

# فرمێسکی ژان

نزار خەیلانی

دلۆپ ... دلۆپ
شیری شەوگاری تەمەنی
دایکی ئەکشێ‌و لە بەرەبەیانێکی
نوێ‌دا ... دەبێتە گیان
لەگەڵ ئاسۆی ڕۆژگارێکی
پڕ بەڵێن‌دا
دەڕژێتە ئاخ دلی سەوزی
چەند شانەیێ‌و دەبێ بە ئاخ
ئاخێو فرمێسکیش هەڵدەچێ
ناوکی نەبڕاوی ژان هەلگرتوش
کپ دەکەوێ
گرو بێ دەنگ لێی دەخەوێ
تۆ مانگ دەنگی لە ناو گەرووی
دایکیەوە دێ

مامان دێتێو پردی خۆراکی
لێ دەبڕێ
بەر لە دایکی بەر لە باوکی
بەر لە خوشکێو براکانی
لەگەڵ یەکەم زارکردنەوەی
چ کچ ... چ کوڕ
ناوی دەنێ بەبەی خاڵۆ
بە بە دێتێو ئۆقرە دەگرێ
لە باوەشی دایکێکی نوێ
خۆی خۆش دەوێ
شیری مەمەی زۆر خۆش دەوێ
بە بە ئۆخەی ... ئۆخەی بەبە
تۆش مرۆڤی‌و هۆزە باڵەت
دابەش دەکرێ

# سەردەمی رۆشنبیری

د . احسان فؤاد



ئەم بیروباوەڕی رۆشنبیری‌یە لە لایەن فەیلەسوفەکانی سەردەمەوە بلاوبوونەوە ، وەنەبێت ئەم تاقمەی ناویان دێ بە فەیلەسوف بە واتای تەواوی فەلسەفە بە فەیلەسوف بژمێرێن ، زۆرتر بلاوکەرەوەو پرۆپاگندیست بوون . لەوەدا چالاکبوون کە گەلێ سەرچاوەی مەزنیان دەخوێندەوە ، لەو بابەتانەی خوێندەوارانی سەردەم نەیاندەتوانی بیخوێننەوەو لێی‌تێ‌بگەن ، پاشان پوختەی سەرنجراکێش دەدایەوە بە گەورەترین ئەلقەی خوێندەوارە ئاسایی‌یەکان . ئەمانە بەراستی خوێندەواربوون ، لە سەردەمەکانی پێشوودا نووسەران زادەی سالۆن‌و دەروازەکانی ئەرستۆکراتی بوون ، یا پرۆفیسورە گۆشەگیرەکانی زانستگا بوون ، یان قەشەو دەستەوبەرە زیت‌و زیرەکەکانی کلیسە بوون کە پالپشتیان‌و گوزەرانیان لە سەرچاوەیەکی ئاینیەوە هەلدەقولا . لە کاتێکدا لە سەدەی هەژدەهەمەوە: نووسەرەکان زۆرتر بەرەی ئازادی‌بیر بوون ، رۆژنامەچی سەربەست بوون ، نووسەری ناو جەرگەی عەشامات بوون ، بۆیە هەموو بەتەنگ‌ئەوەوە بوون لە میللەت وەرگرن‌و بۆ میللەت بنووسن .

لە لایەکی ترەوە بەرەی خوێندەواران تا رادەیەکی زۆر لە پەرەسەندنا بوون بە ژمارە بە رادەیەکی هەستپێ‌کراو کەوتبوونە نەشونماکردن . پیاوە ناسراوەکانی کۆمەڵ تەنانەت خانەدانەکانی سەرەوەشی ، دەیانویست ، لە باری کۆمەڵایەتی‌یەوە لە زانست‌و پێشکەوتنەکانی زانست ئاگادارین .

رۆژنامەو گۆڤار هەتادەهات لە پەرەسەندنا بوو ، ئەو خەلکەی نەیاندەتوانی لە مالەوە بیخوێننەوە لە گازینۆو هۆلە تایبەتیەکانی خوێندنەوە ـ کە بۆ ئەم مەبەستە دروستکرابوون ـ :خەریکی خوێندنەوەی بوون . داخوازیەکی زۆر بۆ فەرهەنگ‌و ئەنسکلوپیدیاو سەرچاوەکانی تری زانیاری هەبوو. ئەم دەستەوبەرە نوێیە : شەیدای کەرەستەیەکی روون‌و سەرنجراکێش بوون ، لایەنگیری ئەدەبیاتێکی بەهرەدارو بەپێزو چێژ بوون . هەر لەم جۆرە دەستەوبەرە نوێیە : ئەدەبیش خۆی سوودێکی گەورەی وەرگرت .

شێوازی ئەدەبیاتی سەدەی هەژدەهەم : شێوازێکی رەوان‌و ئاشکرابوو ، کاریگەری‌ی ئەم جۆرە نووسینانە لە ئەوروپاوە دەکشا تا دەگەیشتە ئەمریکا . چینی ناوەڕاست نەك تەنها خاوەنی چێژی خوێندنەوە بوون ، بەلکو خاوەنی لێکدانەوەیەکی ووردو قوولیش بوون ، بەلام ئەم شەپۆلە نوێیە تەنها سیمایەکی چینایەتی‌ی نەبوو ، بگرە سنووری لەوە گەلێ فراوانتربوو : خوارترین دەستەوبەرەو توێژالی کۆمەلایەتی‌ی لەگەل بەرزترین دەستەوبەرەی ئەرستۆکراتی کەوتبووە ژێر شەپۆلی‌یەوە .

لە لایەکی تریشەوە ، باری ژیانی کۆمەلایەتی کاری‌کردبووە سەر جۆری نووسین.چونکە بەرهەمەکانی کەوتبوونە ژێر چاودێری سانسۆرەوە (رەقابەوە) سانسۆر میللەتی دەپاراست چ لە کەلەکەبازی‌ی هێندێ بازرگان‌و ساختەبازی لە کێشانەو پێوانەدا ،



جان جاك رووسو

چ لەو جۆرە بیروباوەڕەی بە لای میری‌یەوە بە بیروباوەڕێکی زیان‌بەخش دەژمێررا ! جۆری سانسۆر بەپێی هەروولاتێك دەگۆڕا ، بۆنموونە لە بەریتانیا : سانسۆر هێندە کزبوو کە کارێکی ئەوتۆی نەدەکردە سەر بەرهەمەکان .

لە هێندێ وولاتی تردا ، بۆنموونە ئەسپانیا ، سانسۆرێکی بەهێز لەسەر چاپەمەنی دانرابوو ، بەڵام نووسەری رەسەن کەم‌بوو . فەرەنسا کە دڵی ئەم بزوتنەوە رۆشنبیری‌یە بوو ، سانسۆرێکی ئاڵۆزاوو بەهێزی تیا هەبوو کە بەرامبەر کۆمەڵێکی گەورەی نووسەران‌و نەوەیەکی هۆشیاری لینوو بۆ خوێندەواری وەستابوو . پەرلەمانی پاریس ، ئەفسەرەکانی رژێمی پاشایەتی ، دەزگاکانی چاپکردن : هەموو کەم‌و زۆر دەستیان هەبوو لە مەسەلەم سانسۆردا . سانۆری فەرەنسی کە چەکی رژێمێکی درەرەبەگایەتی‌ی پیرو سەقەت بوو بە جۆرێکی نارێك بەڕێوەدەبراو نەی‌دەتوانی بتە ئارەزووی خۆی بیروباوەر لە بێژنگ بدات . لە سالی ١٧٥٠ وە زۆر لاوازتربوو لەوەی کارێکی ئەوتۆ بکاتە سەر نووسەرە بەهێنرەکان .

ئەو جۆرە سانسۆرە زۆرتر نووسەرانی وا لێ‌دەکرد نەتوانن راستەوخۆو بێ‌سڵ ، کێشە زەقە کۆمەڵایەتیەکان‌و ناکۆکیەکانی گەل وەك دەبانەوێت وا باس‌بکەن . بۆنموونە بەپێی یاسا ، نووسەران بەربەست کرابوون کە رەخنە لە دەولەت‌و کلیسە بکرن ، لەبەرئەوە ناچاربوون بە شێوەیەکی بەرەللا (موطلەق) رەخنەکانیان ئاراستەبکەن بەبێ دەست‌نیشان‌کردنێکی ئاشکرا، نەیان‌دەتوانی ناهەموارەکانی کۆمەڵ بەتایبەتی بخەنەڕوو ناچار بە گشتی قسەیان‌لێ‌دەکرد ، زۆرجار بەرهەمەکانیان گیرودەی دوور واتایی‌و تەوسی تەنك‌و رەخنەی شاراوەو گیانی گاڵتەو گەپ‌کردن دەبوو . ئەگەر بەمەشەوە هەر بەرپرسراو بکرانایە ، حاشایان‌دەکرد لەو واتایانەی خوێنەرەکانیان بوی‌دەچوون ، دەیان‌ووت مەبەستی ئێمە ئەوە نەبووە ! خوێنەرەکانیش تووشی مەراقی گەڕان بووبوون بە شوێن بەرهەمی قەدغەکراوا : ئیتر لە هەرکوێ‌یە بیان‌بیستایە فیسارە بەرهەم سانۆری لەسەرە : تامەزرۆی‌دەبوون ، کون بە کون بۆی دەگەڕان ، تا بەدەستیان‌نەخستایە وازیان‌لێ‌نەدەهێنا ! نرخی بەرهەم‌و بیروڕاکانی لەبەر تیشکی ئەم بەربەستکردنەی دەوڵەتا هەڵدەسەنگێنران ، هەر لەبەرئەوەی جەسارەتی تیادایە ، یا تەنانەت لەبەر ئەوەش کە لە پێوانەی رەوشتی سەردەم دەچۆیە دەرەوە. بەم جۆرە سەرئەنجام وای‌لێ‌دەهات ئایدولۆژی رۆشنبیرەکان کاریگەرتر خۆی بنوێنێ بە هۆی ئەم سانسۆرە نیومچلەوە !

وەك ووترا : پاریس بووبوو بە ناوجەرگەی ئەم بزوتنەوەیە ، خانمەکان لە سالۆنەکانیانا ، لە ئاهەنگەکانی ئێوارانداا کە بەهرەدارو خامەبەدەستەکان‌و کەسایەتی‌یە ناسراوەکانی کۆمەڵ بە شێوەیەکی هوشیارانە لە زۆر کێشەی گرنگی کۆمەڵ دەدوان . هەر لەم شارەشدابوو گرنگترین بەرهەمە فەلسەفیەکان‌و ئەنسکلوپیدیا بەناوبانگەکەی Denis Diderot لە هەڤدە بەرگدا لە سالانی ( ١٧٥١ – ١٧٧٢ ) چاپکراو بلاوکرایەوە . ئەم ئەنسکلوپیدیایەی دیدرۆ : مەلبەندێکی خەست دارێژراوی زانست‌و تەکنیك‌و مێژووی زانیاری بوو ، لەگەڵ بلاوبوونەوەیدا شەپۆلێکی رەخنەگرانەی بەرامبەر ژیانی کۆمەڵایەتی‌ی باوو دەزگاکانی هێنایەکایەوە ، کورتەیەکی بەهێزی فەلسەفەی گومان‌و هەڵگەڕانەوەی زانستی سەدەکەی خستەڕوو . ئەوەی شایانی باسە ، وەنەبێت ئەمە یەکەم ئەنسکلوپیدیای چاپکراو بێت: بەڵام یەکەمیان بوو لەوەدا کە بەناوبانگترین‌و مەزنترین‌و نووسەرو فەیلەسوفەکانی سەردەم هاوبەشیان تیاداکرد، لەبەرئەمەیە بە هەنگاوێکی ئیجابی کاریگەر دەژمێرێت لە پێشکەوتنی نوێی کۆمەڵایەتی‌دا . ئەوانەی بەشداریان‌تیاداکردبوو : ڤۆلتێر ، مونتسیکو ، ڕووسو ، دالمبێرت ، دەیەها نووسەری تریش هاوبەشی‌ی ئەم کارە مەزنە بوون .

## سیانەکەی فەرەنسا :

مەبەست لە سیانەکەی فەرەنسا: مۆنتسیکو Montesqieu ، ( ١٦٨٩ – ١٧٥٥ )و ڤۆلتێر Voltaire ( ١٦٩٤ – ١٧٧٨ )و رووسۆیە Rosseau (١٧١٢ – ١٧٧٨) ، ئەمانە ئەگەرچی ناویان بەیەکەوە دێت ، بەڵام تارادەیەك لە چۆنێتی لێکدانەوەدا لەگەڵ یەك جیاوازن . هەرسێکیان لەوەدا یەك‌دەگرنەوە کە بە بلیمەتی سەردەمەکەی خۆیان دەژمێرێن ، هەرسێکیان لە کاری ئەدەبی رووتەوە نووسینی سیاسی – کۆمەڵایەتی وەرچەرخان ، ئارەزایی

کۆمەڵەکەیان بە جەسارەتەوە دەردەبڕی .. هەرسێکیان لەو بڕوایەدا بوون کە باری کۆمەڵایەتی دەتوانرێ باشتربکرێت . لەبەر ئەم هۆیانەیە بەیەکەوە ناودەبرێن ئەگەرچی لە هەڵس و کەوت و بیرکردنەوەشدا تا رادەیەك جیاوازبن .

**(١٧٥٥-١٦٨٩) - Montesqieu**

- لە بنەماڵەیەکی ئەرستوکراتی بارۆنە بە خێزان ، لە باشووری فەرەنسادا کاربەدەستێکی لورد بووە ، لە مامیەوە بە میرات کورسییەکی پارلەمانی ناوچەی بۆردۆی بۆ مابۆوە ، لە دانیشتنەکانی پەرلەمانا ئامادەبوو ، وە لەم پایەیەدا بەردەوام‌بوو لەناو کۆمەڵی ئەو خانەدانانەدا کە لە سەدەی هەژدەهەمدا پاش مردنی لویسی چواردەهەم هەر کاربەدەست بوون . مونتسیکو هەرچەندە هاوبەشی شەپۆلی ئەرستوکراتی‌کان بوو ، بەڵام لە ئازادی‌ی لێکدانەوەی‌دا لە سنووری چینایەتی خۆی زۆرجار دەچۆیە دەرێ . لە بەرهەمە گەورەکەیدا «گیانی یاسا» کە لە ساڵی ( ١٧٤٨)دا بڵاوکراوەتەوە دوو مەبەستی سەرەکی‌ڕێکا :

یەکەم :

کە فەرمانڕەوایی ( حوکومەت ) دەگۆڕێ بەپێی ئاووهەوای کۆمەڵایەتی ، حوکمی بە زەبرو بەرەللا تەنها لە ئیمپراتورەکان هەڵدەکەوێ و بەرهەمی ئاووهەوایەکی گەرمە ، دیموکراسی لەگەڵ دەسەڵاتی یەکگرتووی شارە بچکۆلەکاندا دەگونجێ .

دووەم :

دابەشکردنی هێزو دەسەڵاتەکانە لەنێوان دەزگاکانی دەوڵەتا ، نەك هەموو دەسەڵات بە دەست پاشاوە یان یەك دوو کەسی چینی سەرەوە بێت ، بە کورتی ئەم لەسەر باوەری هاوکێشی و هاوکاری و بەشکردنی هێزە دەسەڵاتدارەکان بوو . بۆ ئەمەش چەند دەزگایەکی ناوەند - کار وەك پەرلەمان ، ئەنجومەنە ناوچەیی‌کان ، کۆمەڵی خانەدانەکان و کلیسە بەلایەوە شایانی ئەوە بوون ئەم هێزی دەسەڵاتدارییەی لەنێواندا بەش‌بکرێت ، بۆ مونتسیکو شتێکی ئاسایی‌بوو بەم جۆرە بیربکاتەوە ، لە لایەك ئەم نوێنەری سەرەوەی کۆمەڵ بوو بەڵام بڕوای بە حوکمی پەرلەمان و خانەدانەکان و ئەنجومەنی شارەکان هەبوو ، ئەوەندەش ژیری هەبوو کە ئاسۆی هاتنی چینی ناوەڕاستو دەسەڵاتداری لە شارەکاندا بەدی‌بکات . بۆ ئاینیش مونتسیکو نەی‌دەویست هیچ تانەو تەشەرەیەك لە ئامۆژگاری‌یەکانی بدات ، بە بیروڕای ئەو ئاین مەسەلەی بەڕێوەبردنی دەسەڵاتی مەرکەزی دەوڵەت ئاسانتردەکات و یارمەتی‌دەدات ، مونتسیکو زۆر دەستووری ئینگلیزی بەدڵ‌بوو بەو جۆرەی خۆ لێی تێگەیشتبوو ، لەو بڕوایەدابوو کە بەریتانیا سەربەستی‌یەکانی چەرخی دەرەبەگی سەدەکانی ناوەڕاست لە هەموو دەوڵەتێکی تر باشترو سەرکەوتوتر بەڕێوەدەبات . مونتسیکو لەو باوەڕەشدابوو کە لە بەریتانیا جیاکردنەوەو پارسەنگی هێزە پێویستی‌یەکانی دەسەڵات بە تێهەڵکێش‌کردنێکی بلیمەتانە جێ‌بەجێ‌کراوە ( پاشایەتی ، ئەرستوکراتی ، دیموکراسی ) کە بەرامبەرەکانیان ( پاشاو ئەنجومەنی لوردەکان و ئەنجومەنی گشتی )یە ، لە لایەك ، لە لایەکی تر بە جیاکردنەوەی دەسەڵاتی جێ‌بەجێ‌کردن و یاساگری و دادوەری . ئەم باوەری مونتسیکو کارێکی گەورەی کردە سەر کۆمەڵ ، ئەگەرچی هاوڕێ - فەیلەسوفەکانی خۆی هێندێ باری سەرنجیان بە سەرنجێکی کۆنەپەرستانەو موحافیز دادەنا .

ڤۆلتێر لە خێزانێکی بورجوازی‌ی خاوەن گوزەران لە ساڵی ١٦٩٤دا لەدایك‌بووە ، وشەی **Voltair** کە نازناوی نووسەرە واتای حەرفی (لانەیەکی بەرزو کەش) دەگرێتەوە ، بە مەعنای (تەوژمی ئەلەکتریکی )ش دێت : لەم رووەوە بەهێزترین لەقەبێکە کە لەناو نووسەراندا دەنگی‌دایێتەوە .

حەتا تەمەنی چل ساڵی ڤۆلتێر بە نووسینی شیعرو تراجیدیاو شیعری پەندو حیکمەت و شیعری داستان ناسرابوو . لەپاش تەمەنی چل ساڵی‌وە (١٦٣٦) رووی‌کردە لێکۆڵینەوە لە کێشە کۆمەڵایەتی و فەلسەفی‌کان . توانستی ڤۆلتێر لە ئاسانی و رەوانی شێوازی نووسینەکانیدایە ، لە هەموو هاوچەرخەکانی رەوانترە بۆ خوێندنەوە ، شێوازی نووسینی پڕە لە مەنتیق و تەوس‌لێ‌گرتن و بەکارهێنانی گاڵتەو گەپێکی پڕ لە مەغزا . وەستایەکی بەهێزە لە هونەری بەکارهێنانی تانەو تەشەرەو دیمواترس تواغ تێگرتندا ، گەلێ جار شێوازی ووتارەکانی بابەتی دوور لە گاڵتەو گەپە ، تا بلێی جیددی‌یە ، کەچی لە کۆتاییدا بە سێ چوار دێری

کورتو خەست ـ داڕێژراو خوێنەران دەخاتە پێکەنین .

لەلایدا ڤۆلتێر یانزە مانگی لە بەندیخانەی باستیلا بەسەربرد ، بەڵام لەپاشانا پەیوەندیەکی بەهێزی لەگەڵ گەورەترینی پیاوە ناسراوەکانی ئەورووپا دروستکرد ، تەنانەت بۆ ماوەی دوو ساڵ هاوسەری فەرەدریکی گەورە ئیمپراتوری (پروسیا) ئەڵمانیا بوو ، لەبەرئەوەی پارەیەکی زۆری دەستکەوت لە بەرهەمەکانیو لە خەڵاتکردنیو لە بەڕێوەبردنی موڵكو ماڵاتەکانی لە کۆتایی ژیانیدا کۆشکێکی گەورەی بەکرێ گرت ، خۆشی ناونا « پارێزەری ئوتێلی ئەورووپا » ، لەم شوێنەدا ئیتر کۆمەڵی ڤۆلتێر بۆ رازو سکاڵا ، بۆ خەم بە باکردنو بەشداری مەجلیسە ڕەنگینو بەتامەکانی هاتوچۆیان دەکرد ڤۆلتێر لە پاریس لە ساڵی (١٧٧٨)دا لە تەمەنی (٨٤)ساڵدا کۆچی دوایی کرد : وەك بەناوبانگترین نووسەرێکی ئەورووپی. بەرهەمە کۆکراوەکانی دەگاتە هەفتا بەرگ . ئەو شتەی زۆرتر ڤۆلتێری خەریككردبوو مەسەلەی ئازادی بیرکردنەوە بوو . ئەمیش وەك مونتسیکو بەریتانیای زۆر بەدڵبوو. تەنانەت سێ ساڵی ژیانی لەوێ بردۆتەسەرو بە دڵ تێکەڵاوی لەگەڵ زاناو فەیلەسوفە پێشکەوتنخوازەکانیدا هەبووە ، هاوبەشی ناشتنی زانای بەناوبانگی ئینگلیز نیوتن کرد لە ساڵی ( ١٧٢٧ )دا ، بە ئەوپەڕی ریزەوە لە پشت تەرمەکەیەوە ڕۆیشت تا گۆرستانی WESTMINISTER ABBEY ، دواهەواری نیوتن .

نامە فەلسەفی‌یەکانی ڤۆلتێر (١٧٣٣) دەربارەی فەلسەفەی ئینگلیزی، پاشان کتێبە ناسراوەکەی « ڕەگەزەکانی فەلسەفە »ی نیوتن (١٧٣٨) نەك هەر بایەخی لێکدانەوەی ئینگلیزی خستە بەردەمی خوێنەوارانی ئەورووپی ، بەڵکو بنچینە زانستی‌یەکانی لەناو فراوانترین دەستەوبەری ئەم وڵاتەدا بڵاوکردەوە . فەلسەفەی ئیستیقرائی (بیکون) ، زانستی فیزیکی (نیوتن) ، فەلسەفەی تاقیکردنەوە تومای (لوك) کە دەیووت : هەموو بیروباوەڕێکی راست لە هەستو لە تاقیکردنەوەوە هەڵدەقوڵی : دەسەڵاتو بیروباوەڕە ئایینی‌کانی دەرزی‌ئاژن‌کرد .

نموونەی بەڕێوەبردنی دەسەڵاتی دەوڵەت لەلای ڤۆلتێر : پادشایەکی دادپەروەر بوو کە بە چاوی میهرەبانیو وەفاوە سەیری میللەتو رەعیەت بکات ، لەسەر هەموویانەوە: چاودێری هونەرو زانست بگرێتە ئەستۆی خۆیەوە !

بۆ ئەم مەبەستە بە ڕێزەوە باسی لویسی چواردەهەم دەکات ، لە بەرهەمێکی تایبەتیدا بە ناوی (سەردەمی لویس) کە لە ساڵی (١٧٥١)دا نووسیوێتی ستایشی لویس دەکات ، هەروەها بە ڕێزەوە سەیری فەرەدریکی گەورەی دەکرد، کە نموونەی پادشایەکی رۆشنبیر بوو (بە لای ڤۆلتێرەوە) پشتگیری هونەرو زانستی دەکرد ، دانی بە هیچ جەوساوەیەکو ئازاردانێکی دینی نەدەنا ، لێبوردنی دینی زامن کردبوو، پروتستانتو کاثۆلیکی بە یەك چاوەوە تەماشادەکرد ، بەو مەرجەی بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی سوودبەخش بن .

لە پاش ساڵی ١٧٤٠وە ڤۆلتێر زۆرتر بەرگی ئامۆژگاری کەرێکی ئایینی پۆشیبوو ، کە دروشمی لێبوردنی دینی کردبوو بە بەرزترین سەوداو ئامانجی خۆی ، دروشمی «میراتی خراپەکاری پێشێل بکەن !» لە لای ڤۆلتێر کرابوو بە بانگ ـ ئاوازێکی جەنگی پیرۆز .

جان جاك رووسو
Jean - Jacques Rousseau

لە بنەماڵەدا وەکو مونتسیکو ڤۆلتێر نیە ، لە ساڵی ١٧١٢ لە جنێڤ لە خێزانێکی نیمچە هەژار لەدایكبووە . دڵی لە پاریسو سالۆنەکانیدا ئەوەندە نەدەکرایەوە. لەبەرئەوەی وەکو منالێك فەرامۆشکرابوو لە تەمەنی شانزدە ساڵیدا رایکردو ساڵەهای ساڵ بە هەرزەیی وەختی بردۆتەسەر ، کاروباری ئاڵۆزاو ئیومچلی کردوە ، وەك مۆسیقا بازی ،تا تەمەنی چل ساڵ سەرکەوتنێکی وای دەستنەکەوتوە لە مەیدانی نووسیند . بەم جۆرە جان جاك رووسو پایە بچکولەی پاخیبووی سەر شەقامەکان بوو . لە لایەکی تر ژیانی سێکسی (جنسی) ئۆر ڕێکوپێك نەبوو ، تا لەدوایدا لەگەڵ کچێکی نەخوێندەواردا جووتبوو کە ناوی تیریسا لیڤا سوور بوو Thérése Levasseur رووسو لەگەڵ ئەم ژنەداو دایکی ـ کە هەمیشە تێکەڵاوی کاروباریان دەبوو، بەیەکەوە دەژیان . پێنج منالی لەم ژنەی بوو ، لەبەر بێ گوزەرانی هەموویانی خستە هەتیوخانەیەکەوە . رووسو لەو کەسانە بوو کە هەمیشە بێپارە بوو ، ئەوەندە خۆی بە پارە کۆکردنەوەو هەوڵدان بۆی

خەریكنەدەكرد ، تەنانەت ئەو كالەش كە زۆر بەناوبانگبوو هەر لەسەر شاباش‌و بەخشندەكانی هاوڕێ نزیكەكانی دەژیا . لە تەك ئەمانەشدا زۆر باسی چاكەكانی خۆی‌و خراپەكاریی دەوروپشتەكەی دەكرد ، گومانی لە پاكی هەموو دۆستەكانی هەبوو ، لەگەڵ كۆمەڵدا نەدەگونجا خۆی بە بێكەس‌و چەوساوەو ئازاردراوو دەستبڕیو دەزانی ، سكاڵای لەوە دەكرد كەسی وانیە گوێ‌بۆشل‌بكات‌و لێی‌تێبگات . لەوانەبوو كە نەخۆشی دەروون بوو ، زۆرتر پارانویس بووبێ (Paranoic) واتە هەستكردن بە ناتەواوی‌و زەلیلی ، یان حەزكردن بە گەورەیی‌و مەزنی (جنون العظمة)ی هەبووبێ .

لەگەڵ ئەم لایەنە كزو سلبیانەشدا خاوەنی فەلسەفەیەكی قووڵتربوو لە هاوچەرخەكانی ، لە تاقیكردنەوەی خۆیەوە هەستی‌دەكرد كە پیاوچاك لە كۆمەڵەكەیدا چەوساوەو زۆرلێكراوو پێشێل‌كراوە . رووسو ئەوەندە رێزی لەو پێشكەوتنە نەدەگرت كە هاوچەرخەكانی بە نازەوە سەیریان‌دەكرد ، تەنانەت ئەقڵ‌و مەنطیقیش بەلایەوە لەوانەبوو دوور ـ كوژو خەڵك چەواشەكەر بێت .

ئەقڵ لەلای رووسو ـ ئەگەر تاكە پێوانەی سەرپشك بێت ـ لەوانەیە ببێت بە رابەرێكی ساختە . لە دوو بەرهەمیدا « هونەرو زانست » ١٧٥٠و « سەرچاوەی نایەكسانی » ١٧٥٣ ، بە ئاشكرا ئەوە دەردەبڕێت كە تەنها لە باوەشی سروشتدا ژیان بەختیارترو باشترە . ئەوەندە گومانی خستۆتە سەر زانست كە ڤۆلتێری هاوڕێی پشتئەستوور بە زانست ، دەڵێت : « پاش خوێندنەوەی ئەم دوو كارە وام هەستدەكرد كە بە چوار پێ دەڕۆم ! » .

هەستێكی تەماویی نادیار لەلای راسترو رەوانتربوو لە رەخنەیەكی زانستی‌ی ووشك كە تیمارو سارێژی برینەكانی مرۆڤایەتی نەكات ، خوا : بەلای رووسووە هەر هێزە سەرو گەورەكەی دنیای چاكەو خراپە نەبوو ، بەڵكو ئەو هێزە مەزنە نادیارەشە ، دەروون دەخاتە جۆش‌و جوانی دەخاتە بەروبوودم ، خوای جوانی‌و خۆشەویستی‌ش بوو . بەم جۆرە رووسو لەناو هاوبیرەكانیدا بە «رۆڵەی پاكی باوەشی سروشت»و (سۆزو هەست پەرست) دەژمێرێت . لەپاش نیو چەرخ ئەم عاتیفە پەرستی‌و سروشت پەرستی‌یەی ئاسۆی ئەدەبی رۆمانسیەتی گرتەوە ، هەروەها بوو بە یەكەم سەرچاوەی جیهانی سەرەوەی هەست ، جیهانی سەروو واقیع‌و لێكدانەوەی سریالیەكان . لەپاشانا رووسو لە كتێبی «كونتراتی كۆمەڵایەتی»دا

1762 - Social Contract

ئەوەی دەربڕی كە ئادەمیزادی چاك تەنها لە كۆمەڵێكی پێشكەوتوو پاككراوە لە خراپەكاری پێدەگات ، ئادەمیزاد لەم جۆرە كۆمەڵەدا لە ئەنجامی هوشیاریی خۆیەوە دەتوانێ واز لە بەشی سەربەستی‌ی خۆی بهێنێت ، پێشكەش‌بكات بە

فێركردنی ئیلزامی مایەی بنیادنانی ژیانێكی بەختەوەرە

هێزو ئیرادەی گشتی ، بەلای رووسووە ئەم ئیرادە گشتی‌یە هێزێكی پیرۆزی بەرەڵلای گومانلێنەكراوە ، ئیتر كاربەدەستانیش لە پاشاو ئەفسەرو ئەندامانی پەرلەمان : نوێنەری ئەم توانستە پیرۆزە یەكگرتووەن ، ژیانی كۆمەڵایەتی بەم ئیرادە گشتی‌یە لە سایەی دادپەروەری‌و ئازادی‌دا پێش‌دەكەوێت .

بەم جۆرە بیروباوەڕی رووسوو هاوڕێكانی لە ماوەیەكی كەمدا هەموو دەستەوبەرەو توێژاڵەكانی كۆمەڵایەتی جووڵاند ، تا لە دوایدا بوو بە كەرستەی یەكەم شۆڕشی گەورەی جوولێنەر لە مێژووی نوێی مرۆڤایەتیدا : ئەو شۆڕشەی یەك ساڵ پاش كۆچی دوایی رووسوو ڤۆلتێر ؛ لە ساڵی (١٧٨٩)دا لە فەرەنسادا تەقیەوەو لەپاشانا هەموو وڵاتەكانی ئەوروپای شلەقاند .

# کۆمەڵە چیرۆکی «ڕێگا» و چەپکێک سەرنجی ڕەخنەگرانە

● لەم چەندانەی دواییدا نووسەران و ڕۆشنبیرانمان هەستیان بە ئۆبالی پڕ کردنەوەی کەلێنێکی تری ئەدەبەکەمان کردو . هەندێکیان بە پێی توانا هەوڵیان داوەو چەند کەسێکیشیان بەرهەمی ئەو هەوڵانەیان بە نامیلکەی خنجیلانە خستە بەردەم خوێنەران . ئاشکراشە ئەو کەلێنە (ئەدەبی منداڵان)ە . ئەوەبوو ئەمساڵ چەند نامیلکەیەك کەوتە بەر دەست کە زۆربەیان بۆ چیرۆکی منالان تەرخان کرابوو .

● چیرۆکی منالانیش خاسیەت و شێوەی تایبەتی خۆی هەیەو زۆر لە کەلە نووسەرانی ئەم جیهانە بەر فراوانەش دەستیان نەداوەتێ لەبەر ئەوەی کە توانایان بەسەردا نەشکاوە . بۆیە ئەدەبی منالان بە گشتیو چیرۆك بەتایبەتی هێندە کارێکی ئاسان نییە کە هەر کەسێك پەنجەی قەڵەمی گرت دەست بدایە پەرەپەش کردنەوە بە نیازی خزمەتی منال لە پاشانیشدا هیچی بە هیچ نەگردبێ .

● چیرۆکی منالان تەنیا گێرانەوەیەکی حیکایەتخوانانەی ڕووداوێکی سادە نییە کە پڕ بێت لە ئامۆژگاری و زۆرشتی (ئانوی) دیکە . ئەو کاتەش بەسەرچوو کە چیرۆکی منالان پڕ بێ لە بای دێوو درنج و شێرو پڵنگ و ڕێوی و جووجەڵەو شتی تر لەوەش ڕابووردین کە بڵێین منالەکە پەنجەرەکەی شکان یان دڵی ماڵە دراوسێکەی عاجزکرد یان بە قسەی باوکی نەکرد یان .. یان .. هتد .

چیرۆکی ئێستا پێویستە وا لە منال بکات بیربکاتەوە . بیربکاتەوە تا هەست بەو شتانە بکات کەلەدەورو بەرین . چیرۆکی ئێستا پێویستە وا لە منال بکات کە میروولەیەکی دی دەنکێ گەنم وەیان بروشێکی بە دەمەوەیە بیربکاتەوە بزانی ئەو میروولەیە ئەمەی بۆ کردووە ؟ .. مەبەستی چییە ؟ .. دەیەوێ چی بکات ؟ .. باشە ئەگەر ئەو شتێکی لەو بابەتە بکات کارێکی باشە یان خراپە ؟ .. ئایا چی لێوە فێربوو ؟ باشە ئەگەر ئەمە نەکات چی بکات ؟ یان ئەو بەو بچووکییەوە هەستی بەو لێپرسراوییەی سەر شانی کردووە ، ئەم لە ئێستاوە دەبێ چی بکات ؟ ئەمانەو زۆر شتی تر . دەیان چیرۆکی منالان لەم سەردەمەدا دەبێ باسی زانست و تەکنولۆژیاو لایەنە نهێنییەکانی ژیانی خۆیان و دەوروبەرەکەیان بۆبکات ، بەلام بە شێوەیەکی ڕەوان و سادەو بە زمانێکی بێ گرێو رتووشی منداڵانەو بە دەست پێ کردن و کۆتایی پێ هێنانێکی سەرنج ڕاکێشەرانە کە منال وا لێبکات بە دوای ئەنجامدا بگەڕێ و واز لە خوێندنەوەی چیرۆکەکە نەهێنێ بە نیوەچڵی . ئەمانە هەمووی و لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی مەرجێکی تری سەرەکی کە ئەویش ئەوەیە دەبێ ئەو نووسەرەی کە چیرۆکێك بۆ منالان دەنووسێ وا بزانێ بۆ کام منالەی دەنووسێ ـ لێرەدا مەبەست لەقوناغە ـ چونکە سەردەمی منالی بە پێنج قۆناغدا دەڕوات کە هەر قۆناغەی ئەقلیەت و جۆرەی بیرکردنەوەی منالان تیایدا جیاوازە لەوی تر ، چونکە ئەو منالەی کە تەمەنی (١٢) ساڵانەو لە چیرۆکێك بە جۆرێك دەگات لەوانەیە منداڵێکی پێنج ساڵ ویان (٦) ساڵی هەر تێشی نەگات .

● پێم وایە ئەم چەند دێرە ڕێی بۆ خۆش کردبێتم تا بچمە ناو باسەکەوەو لە کۆمەڵە چیرۆکی (ڕێگا) ی (کاك حسێن بەفرین) بدوێم .

● سەرەتا پێویستە ئەوە بڵێم کە کاك حسێن کارێکی هەتا بڵێی چاکی کردووە کە نامیلکەکەی پێشکەش کردووە بە گیانی پاکی [ کارزان، فرمان ، ئازاد ، ڕێبوار ] ئەو چوار خونچە ئەمرەی کەهەرگیزاو هەرگیز لەیاد ناچن و لە مێژووی هونەری گەلەکەشماندا لاپەرەی پڕ شانازیو ئەمری و ـ شەرەفمەندێتی یان بۆ خۆیان تۆمارکرد ، و یەکەمین کۆمەڵە منالێکیش بوون کە بوونە شەهیدی ڕێگای هونەری کوردیمان ، بۆیە بۆم هەیە بڵێم کە پێویستە هەموو بەرهەمی منالان کە لەمەودواش

چاپ دەکرێن پێش‌کەش بە [ چوار خونچە نمرەکەی دایکی هونەر ] بکرێن .

دیارە کاك حسێن سوردی‌لە کەلەپووری میللیمان وەرگرتووە ، سەرەڕای ئەو بەسەرهات‌و ڕووداوە سەرنج ڕاکێشەرانەی لەدەمی ئەم‌و ئەوی بیستووە .. هاتووە زیرەکانە بە تەکنیکێکی هونەری نوێوە !! دایڕشتوونەتەوەو خستوویەتە بەرچاومان .

کاکی نووسەر سەرکەوتنی بە دەست هێناوە کە زۆربەی چیرۆکەکانی بە شێوەیەکی کۆمێدی‌و گاڵتەجاڕی‌یەوە – بە جورێك کە لە گەڵ زەوقی منالدا بگونجێ – داڕشتووە . ئەوەی زیاتر نرخی بە نامیلکەکەی داوە کورتی چیرۆکەکان‌و پڕمانایی‌یانە کە دوورە لەو درێژدادڕی‌یەی کە منال زوو لێی وەڕز دەبێ‌و وازی لێ‌دەهێنێ . پاشان هەر بە هۆی ئەم نامیلکەوە ویستوویەتی زیندوویەتی هەندێك ووشە بپارێزێ (کە بە ڕای من ئەم نامیلکەیە کە بۆ منالانی تەرخان کردووە ، جێگەی ئەمەی تیا نابێتەوە ، دەبووایە هەڵیگرتایە بۆ دەرفەتێکی تر) ، ئەمانە هەمووی سەرەڕای لەبەر چاو گرتنی مەرجە سەرەکیەکە کە چیرۆکی بۆ هەموو قۆناغەکانی منالی نووسیووە .

ئێستاش سەرەی ئەوەهات کە بە چەند خالێك کەم‌کووڕیەکانیشی لەم چەند دێرەی خوارەوەدا کورت کەمەوە .

● لە ناوەرۆکی هەندێك لە چیرۆکەکاندا منال بە شێوەیەکی چەوت ڕێ‌نمایی دەکرێت ، وەك لە چیرۆکی (درۆی زیتەڵە) ، کە بە ئاشکرا دیارە کابرای درۆزن سەرنەکەوێ‌و بێ‌گومان ئەمەش وا لە مندال ئەکات ، کە ئەوانیش بیر لە دۆزینەوەو دروستکردنی درۆی زل‌و ناپەسەند بکەنەوە ، جا درۆکان چ ڕەش بن یان سپی کارێکی سلبی‌یان هەیە بۆ سەر پەروەردە کردنی منالان .

یاخود لە چیرۆکی (جگەرە کێشاندا) واناکات کە پالەوانی چیرۆکەکەی لە دەردی جگەرە کێشان ڕزگار بکات ، چونکە لە کۆتاییدا دیسانەوە با ئەداتەوە سەر هەمان ڕەفتار ؛ دیارە ئەمەش وا بە بیری منالدا ئەهێنێ کە جگەرەکێشان – کە زۆر منال هەر لە منالییانەوە فێری دەبن – ڕزگار بوونی بۆنییەو قسەی دکتۆریش ئێرەو ئەوێ بڕ ناکات .

● پالەوانی چیرۆکەکانی کاك حسێن زۆربەیان بەزیون‌و هەندێکیان نائومێد بوون ئەنجامیانەو هەندێکی تریشیان لە بۆشاییدا ئەسوڕێنەوە ، ئەوە تا لە چیرۆکی [شەوێکی تاریك ، ماف ، تەڵە]دا پالەوایان تێدا بەزیون . چیرۆکی [ڕێکا]ش ئەنجامەکەی نائومێدبوونە .

● لە لایەنی هەڵبژاردنی بابەتی چیرۆکیشەوە ، بەداخەوە کە سەرکەوتنێکی ئەوتۆ وەدەست ناهێنێ ، چونکە ڕووداوی وای کردۆتە ناوەرۆکی چیرۆکەکانی کە کەم تا زۆر ئەو بەسەرهاتانە ، پەیوەندیەکی وایان نییە بە منالانەوە سەرەڕای ئەوەی کە هەندێکیان زۆر لە کۆمەلگای کوردەواری ئەمرۆمانەوە دوورن . لە چیرۆکی [درۆی زیتەڵە]دا هەر چەندە لە کەلەپوورەوە وەریگرتووە سەرەڕای کاردانەوە سلبیەکەی پەیوەندی‌ی بە منالانی ئەم سەردەمەی کۆمەلگاکەمانەوە نییە ، ئەمەش دەلالەت لە قوول نەبوونەوە و چۆنیەتی سوود وەرگرتنی نووسەر دەکات لەگەڵ کەلەپووردا.

یان لە چیرۆکی [مەیلی لە فرینە] لە جیاتی دینار ، دۆلاری بەکارهێناوە ... هتد .

ئەمەیان لە لایەك‌و لەلایەکی تریشەوە بەسەرهاتی چیرۆکەکان بە هیچ جۆرێك پەیوەندی‌ی بە ژیانی منال‌و منالییەوە نییە ، ئەمە لە کاتێکا کە پێویستە چیرۆکی منالان باس لەو ناکۆکی‌و پەیوەندی‌و ڕووداوانە بکات کە بە سەر منالدا ڕوو ئەدات ، یاخود ئەو جۆرە شتانەی کە پەیوەند یان بە واقعی ژیانی منالەوە هەیە . کە پیویستبوو کاکی نووسەر ئەم خالەی بە سەرەکی ڕەچاو کردایە. لەو چیروکانەی کە ئەم دیاردەیان تێدایە چیرۆکی [درۆی زیتەڵە – مەیلی لە فڕینە – شەوێکی تاریك – تەڵە – دوو ئاوانەکە – هۆبە]

● ئەنجا نۆرەی ئەوەهات باس لەوە بکەم کە ئەو شێوەیەی ئەم چیرۆکانەی لە خۆ گرتووە زۆر ئالۆزەو زۆر لە سەروو تێگەیشتنی منالیشەوەیە . کاك حسێن بە ئاشکرا [حوارو مەنەلۆج‌و تەداعی] بەکارهێناوە کە ئێستا لە چیرۆکی سەردەمدا بەکار ئەهێنرێ . جا نازانم تا چ ڕادەیەك منالانی کورد تێی ئەگەن ؟ .

سەرەڕای ئەمە کاك حسێن تەعبیراتی ئەدەبی زۆرو ئالۆزی بەکارهێناوە کە دیسانەوە ئەمیش لە ڕادەی تێگەیشتنی منالەوە

دووره . نازانم (بەفرین) ئەمەیانی بۆ کرد ؟! تۆ بڵێی مەبەستی وا بوو‌بێت کە منداڵان فێری ووردبوونەوەو قووڵبوونەوە بکات؟!! یان مەبەستی تری هەبووە .... !!

● جگە لەمانەش زمانی چیرۆکەکان تا بڵێی وشك‌و ئاڵۆزەو منداڵ زۆر زوو بێزار ئەکات‌و وازیان پێ لێ‌ئەهێنێ . تەنانەت وشەی وای تیایە منداڵی بەسەزمان هەر نازانێ ماناکەی یانی چی‌و چی ئەگەیەنێ ؟ .

● دیارە کاکی نووسەر لە چیرۆکی سەردەم قووڵبۆتەوەو بێ بەش نییە لە شارەزایی دەربارەی چیرۆك بۆیە هەندێك لە چیرۆکەکانی ئەم نامیلکەیەی ــ کە بۆ چیرۆکی منداڵانی تەرخان کردووە ــ دەتوانم بڵێم کە بە چیرۆکی زۆر کورت لە قەڵەم ئەدرێ ، لەمانەش وەك (هۆبە ــ دوو ئاوانەکە ــ مەیلی لە فرینە ــ شەوێکی تاریك ــ سەر قاڵ بوون) بەڵگەشم بۆ ئەمە ، ئەو چیرۆکەیەتی کە لە گۆڤاری بەیان ژمارە (٥٠) بلاوی‌کردەوە بە ناوی (خەندەیەکی ناسك) کە لەژێر ناونیشای (چیرۆك بۆ منداڵان)ەوە لە نامیلکەکەیدا بلاوکردۆتەوە بەڵام ناونیشانەکەی گۆڕیوەو کردوویەتی بە (سەرقاڵ بوون) . جا نازانم ئەو چیرۆکانەی کە ناومان هێنا ، چۆن بەناوی (چیرۆك بۆ منداڵان)ەوە بلاوی کردنەوە ؟ .

● لە پاشاندا هیوا خوازم کە سوودێکم گەیاندبێ‌و لە کۆتاییشدا سەرکەوتن بۆ نووسەران‌و پیرۆزی بۆ وشەی ڕەسەن‌و ئاسۆیەکی ڕوون‌و بەرفراوانیش بۆ منداڵانی کورد .

# ستران و لاوك و مقام و چیرۆك چ كار د ژیانا كومەلایەتیا مللەتێ كوردده هەیە

حمدی عبدالمجید

١ ــ ستران تێتە گوتن ژ وان سترانێ تێنە گوتن لسەر شەڕا و یان تشتێت مێژووی ، وەکی سترانا حەمێ موسێ ، عەمێ گۆزێ ، بشارێ چەتۆ ، عەلیکێ بەطێ ، شێخ مەحمود ، ئەڤ سترانێ‌ها کارەکی مەزن دکن د ژیانا مللەتێ کوردده ، تێ دگەهینن ک مێرانی چیە ؛ چاوا مرۆڤ دگەهن ئاڤداریێ چاوا ناڤ و دەنگ بو پەیدا دبن چاوە بەرەڤانیێ ل ئێلێو عەشیرەتو ئاخا خوە دکن ، ئەڤ هەمو دبی نڤیساندنەك ددلێ گوهداران دە .

د چاخێ بەرێدە ل جهێ بۆطا گەلەك ئەڤ ستران بهابون و جهێ ڕێز لێ گرتنێ بون ، تێتە بیرا من ستران بێژەك هەبو گەلەك بناڤ و دەنگ بو ناڤێ وی ئەحمەدێ یەغمور بو ، ئەڤ ستران بێژێ ها گەلەك چێرۆك و ئەفسانە هاتنە گوتن لسەر سترانێ وی چاوە هندە سترانا دزانێ وە چاخێ سترانا دبێژێ ناوەستی ، هندەکا دگوت دۆستەکا وی هەیە ژ ئەجنا ئەوڤان سترانا بو چێدکێ یان دبێژێ .

چاخێ ئەحمەدێ یەغمور دهاتە گوندەکی بەردەستێ ئاغایێ گوندی دچاخێ ڕۆژ ئاڤابونێ‌دە گازی دکر : هەی‌هێ ئەحمەدێ یەغمور هاتیە کوچکا ئاغێ وی ئێشەڤ سترانو لاوکا بێژێ داهون بزانین .

چاخێ مرۆڤا ئەڤ دبهیست تە ددیت سلو دگوتە محو مزگینی ل تە ئێشەڤ ئەحمەدێ یەغمور هاتیە وێ سترانو لاوکا بێژێ . یەکی مزگینی ددا بێ دی و دگوت زاروکا ژی ژ بیر نەکێ بلا دگەل دایکا خوە بێن دا گوهی بدن سترانو لاوکێ ئەحمەدێ یەغمور .

پشتی نڤێژا شیڤێ دهاتە کرن تە ددیت چاوە مرۆڤێت گوندی دهەرکین ب ژن و مێر و زارۆك و پیر و جوان ، کچ و کوڕ هەموا پێکڤە بەرێ خوە ددا کوچکا ئاغێ وەکی جوا ئاڤێ چاوە دهەرکێ یان چاوە مێرۆ ژ کول میروەکێ دچن بو یادی .

جهێ مرۆڤان ل کوچکێ نە دما بان و خانیێ دورا کوچکێ تژی سەر دبون هەمو دهاتن دا گوهێ خوە بدن ستران و لاوکێ ئەحمەدێ یەغمور ، چنکو گەلەکا ژوان باوەر دکرن کو دەنگێ ئەحمەدێ یەغمور دەرمانێ هەمو دەردایە .

پشتی مرۆڤ کۆمدبون ئەحمەدێ یەغمور بالکەڤ ددانی سەر هەردو چوکێ خوە کومێ [کولاڤ] خوەیێ بۆطانی خوار دکر هەردو دەستێ

خوه دکرن بن گوهێ خوەده دەست ب ستران و لاوکا دکر هندە جارا حەتا سپێدێ لێ ددا .

چاخێ دبو رۆژ تە تەماشا کربا کو مرۆڤ دگەهشـتنە ێێکـو دو صۆرو دگوت جانکو لاوو تـە دیت شەڤێ دی ئەحمەدێ یەغمور چ کر ؟ جانکو دگۆت صۆرو لاوو ئـەڤ مرۆڤ نە دوەستاو نـە دەنگی وی دکـەت هنـدی دچو دەنگی وی خوەشتر دبو : صۆرو لاوو مـات نزانێ کو یارا وی یا ئەجنە ل بـەر تەنشتاوی رونشتبو دەرس دگوتیێ وەکی مەلا دەرسا شاگرتیا دبێژنێ .

بەلێ جهێ داخو کەسەرایە ئەڤ هنەرمەندێ نوردێ مـەزن بمرێ و بچی کەس جهێ وی نەگرێ . ئەڤ هنەرمەند د چاخەکیدە بێ کو دەنگ گرتوك نەبن کو دەنگێ وی بگـرن دابشتی ویرە گوهێ خوە دابانێ دا بهایێ وی زانیبانا .

بەلێ هندەك شاگرتێ وی هەبون وەکی سلیمانێ رەموێ فەقە لێ بەلێ نە شاگرتیێ وەکی دلێ وی بون ، دگـەل ڤێ هنـدێ کا سترانێ ئەحمـەدێ یەغمور گـەلـەك ژوان وندابون . کا دەنگـێ ئەحمـەدێ یەغمور . کا ئاوازی ئەحمـەدی یەغمور ؟

ب مرنا ئەحمەدێ یەغمور گەلەك سـتران ولاوك و ئاوازێ کوردێ دگەل وی چونە گۆرێـدە حەیف و مخابنا وان .

٢ ــ لاوك لێنـــە گوتن بو وان سـتران و لاوکـێ ئـەڤینێ و ئەڤینداریێ ئەڤ هـەمو قوناغـێ ئەڤینیێ ئەڤینداریێ تێنە بەر چاڤێ مرۆڤان ، سەر هندێرە پەصـنێ چاڤ وبرۆ [برە] دفـن ، دەڤ ، لێڤ ، مەمك ، بەژن ، نۆق ، بسك ، کەزی ، کەماخ ، ددان ، زمان ، ئانی هنارکێ روا ، برێڤە چونا یارێ تێدە هەبون ، تە دیتبا چاخێ دگۆت .

بەژن درێژە نوق زراڤە کەماخ کیفروشکە لێڤ تەنکە دفن چلاکیە خزێم شۆرە چاڤ رەشە چاڤێ خوە قتکی کلدانە ئاور شەواتە ئاورێ ڤێ میراتێ میرات بابێ وەکی تیرا مرۆڤ دهنگێفن مەمك سێڤێ خەلاتێ نە مەش نۆردەکـە ددان مراریەنە برۆ کەڤانە ئانی دەقە کەزی زمرە کەزی رەشە وەکی جوتـەکی مارێ رەش هنارکێ روێ ڤێ مال میراتێ تـو دبێژێ لبێ هنارا پێڤە پەڤاندنە .

ژ بلی ڤان پەصنێ یارێ پەصنی چەکێ یارێ ژی تێدە هەنە وەکـی کـل ، قوتی ، بازن ، خرخـال ، گوستیلك، حەیاسە، قولان، گوهار، قرفل هەمو چەکو تشتێ پەیوەندی بە هەردو یاراڤە هەبن .

ژ بلی هندێ کا چاوە ئەڤینـدار دخوازێ خو بگەهینێ یارا خوە و چ نەخوشی د رێدە هەنە ناگرێ ئەڤینێ چەنـد دژوارە و چ کار د هەردو ئەڤینداراده دکێ . کارێ گەلاجـا [فەسادا] چ یە د تێك دانا ئەڤینێ و نەگهاندنا هەردو ئەڤینـدارا دە دایکو بابێ هەردو ئەڤیندارا، دەستە برا و دەستە خۆیشك چ دکن .

چاوا خۆرت دوستا خوە درەڤینێ ئەگەر چ رێ نەبن بو گهاندنا وان ، ئەڤ تشتێ ها هەمو تێتە بەر چاڤێ مرۆڤان ئەگەر گوهێ خوە ددانا لاوکا وەکە شەریتەکا سینەمائی .

ئەڤان لاوکا کارەکی گەلەك مەزن هەیە دگیانێ کـورۆ کچێ کورد دە د چاڤێ خۆرت و گەنجیدە .

٣ ــ مقـام تێنـــە گۆتن ژ وان پەستارە ئەوێ تێنـــە گۆتن ل ناڤ داوەت و شاهیا و ، گوڤەندێ ل بەر دگرن و خوە ل بەر دهلاڤێژن .

هندەك مرۆڤ ل هـەر گوندەکی تێنە دیار کرن بو ڤێ هندێ . ئەگەر گۆڤەند و شـاهی داهۆل و زرنـە کەماچە و عەرەبانە ــ دەڤ ــ نەبن .

تـە ددیت گورۆ گازی دکـر وا کرێتو وەرە دا ئەم بچن داوەتا رەمو . سالۆ هاتیە وێ مقـامێ داوەتێ و گوڤەندێ بێژێ . رەمو دگۆت ل من ببورن داهۆل و زرنە و کەماچـە و عەرەبانە نەبو مە سالۆ ئینایە دا مقاما بێژێ . تە دنەری هەما خۆرت و کی دەستێ هەڤ دگرتن و سالۆ دەست ب مقاما دکر دگۆت و خورت و کچا لێ دڤەگەراند .

هەر توخمە شاهیەکێ مقامێ خوە هەنە ، ئەڤ خوە هلاڤێتنا ها چەپە طورانیە ئەڤاها گوچەریە ئەڤـاهـا بوطانیە هەر چار یەکەکێ سـالۆ وەردگێرێ سەر توخمەکی حەیا کو خورت و کەچك دوەستان کارێ وا هەر ئەو بو .

خورت و کچا د ژیانا خوەدە هەر چ دنیایێ نەدزانن ژ بـل کێف و حەنەك و خوەشـیێ گوهێ وان ل سەر هندێ بو کا کەنگی داوەت و شاهیەك ل گوندی چێ دبێ .ژ بل ژیانا بڤی رەنگی نە دزانن و دناڤ ڤان داوەت و شاهیا دە خورت و کچا دۆسـت و یار دگرتن و ئەڤین پەیدا دبو دناڤ بەینا کچو کورا دە .

٤ ــ ل هەر گوندەکی ئەك یەك چیرۆك بێژ هەبو بەلکی چەند چیرۆك بێژ هەبون .

چاخێ دبو سـەری زڤـستانێ لە دنەری خورت ل هـەڤ کومدبون پشتی شـیڤ خوارنێ کا بچن مالا مالاکێ ئیشـەڤ و کێ وێ چیرۆکا بێژێ .

جارنا هەر شەف ل مالەکێ کومدبون و جارنا هەرو هەر ل مالەکە تەنێ دبون و چیرۆکبێژ وێ دەست ب چیرۆکا خوە کربا گوتبا جارەکێ ژ جارا رەحمە ل دێ و باڤێ گوهدارا هەبو نەبو کەس ژ خودێ مەزتر نەبو .

وی دەست ب چیرۆکا خوە کربا. چیرۆک ژی چەند توخم هەنە چیرۆکێ ئەڤین و ئەڤینداریێ و چیرۆکێ شەڕو میرانیێ وەکی چیرۆکا روستم .

ناڤێ میرزا ئەحمەد و میرزا محەمەد د هەمو چیرۆکێ مرۆڤاتیێ و سۆز بجێئینانی دهاتەگوتن .

گەلەك جارا ناڤێ هارۆن رەشید دهاتەگوتن و بهترین ناڤێ حاکمێ جزیرا بۆطا د چیرۆکا دە هەبو .

مرۆڤێ ئەڤیندار یان ئەوێن دخومستن ببن ئەڤیندار بو خوە هور و کور ل چیرۆکێ ئەڤین و ئەڤینداریێ تەماشا دکرن و مرۆڤێن ژ مەردیتیێ حەزدکرن گوهێ خوە باش ددان چیرۆکێ مەردینی تێدە هەبێ مرۆڤێن ژمیرانی و شەڕا حەز دکرن هەر و هەر گوهێ وان ل سەر وێ بو کا کەنگی چیرۆکا روستەمێ زالێ دی بێتە گۆتن و کی وێ بێژێ، چنکو چیرۆك بێژی گەلەك کارێ خوە د گوهداریدە هەبو . بەلکی چاوە گۆتن و لێکدانا چیرۆکێ ژی گەلەك کارێ خو دگوهداریدە هەبو .

ب ڤی رەنگی خوڕتو کچێ کوردستانێ فێری میرانی و ئەڤین و مەردینیێ دبون هێشتا بچوك . ڤان چیرۆکا کارەکی مەزن هەبو دژیانا واندە .

# ئاوازی سەرکەوتن لە چیرۆکی «شەن»دا

**دلشاد علی**

چیرۆك نووسی بەناوبانگ «ئارنست هەمەنگوای» دەربارەی چیرۆکەکەی ـ (پیرەمێردو دەریا) ئەلێت : «ئەتوانرێ مرۆڤ بروخێنرێ بەلام ناتوانرێ بەزێنرێ» ، هەر ئەم بیرەشی کردۆتە بنکەی چیرۆکەکەی ، ئەو چیرۆکەی کە باسی ڕاوچییەکی کوبایی هەژار ئەکات کە دەرامەتی ژیانی لەدەریادا بە دەست ئەهێنێ ، بەلام ماوەی هەشتاو پێنج ڕۆژی ڕەبەق بە دەستی بەتاڵ ئەمێنێتەوە تا لە دواییدا ئەتوانێ ماسییەکی گەورە ڕاو بکاو بە ئازایەتییەکی بێ سنوورەوە دەیهێنێو دەیبات و بەرهەلستی دەریاو تەنهاییو تینوبەتی ئەکات ... چیرۆکەکە بریتییە لە داستانی تێکۆشانی مرۆڤ دژی نالەباری سروشت و ئاوازی سەرکەوتنی دڵی گەورەی مرۆڤە بەسەر ـ ناومێدیو

بێهوودەیی‌دا ..

ئەم جۆرە بیرەو ئەو بڕوا بوونە بە توانای مرۆڤ ئەگەرچی جاروبار لە ڕوانگەی ترەوە لە چیرۆکی کوردی‌دا سەری هەڵداوە ، بەڵام تا ئێستا ڕاستەوخۆ نەخراوەتە چوارچێوەی چیرۆکی کوردی‌یەوەو کێشەی مرۆڤی کورد دژی دیاردە سروشتی‌یەکان کە بێگومان لە ژیانی ڕۆژانەی جوتیاراندا بەتایبەتی سەدەها نموونەی هەیە تا ئێستا ئاوڕی لێ ـ نەدراوەتەوە ، جا هەست کردن بەو کێشەیەو سەرهەڵدانی تیشکی ئەو بیروباوەڕە لە چیرۆکێکی کورتی کوردی‌دا پێویست بەوە ئەکات کە ئێمەش وەك خوێنەرێ سەرنجی لێ بدەین‌و ڕادەی سەرکەوتنی دەست نیشان بکەین .

ئەو چیرۆکەش کە دەمانەوێ لێرەدا سەرنجی لێ‌بدەین چیرۆکی (شەن)ی سەلام مەنمی‌یە کە لە ژمارە (٤٣٩)ی ڕۆژنامەی هاوکاری‌دا بڵاوکراوەتەوە ، با ئەوەش بڵێین کە ناوهێنانی هەمەنگوای‌و چیرۆکەکەی تەنها بۆ ئەوە بوو بیهێنینەوە یادی خوێنەر کە چۆن ئەو کێشەیەو ئەو بیروباوەڕە لە ئەدەبی گەلانی تردا هەر لە زووەوە سەری هەڵداوە ، نەك بۆ ئەوە بوبێ کە سەلام مەنمی لەوەوە بیری چیرۆکەکەی وەرگرتبێ چونکە هەموو نووسەرێکی ڕیالیزمی هەڵگری ئەو بیروباوەڕەیەو بڕوای بە تواناو لێهاتویی مرۆڤ هەیە

هەر لە سەرەتاوە هەست بەوە ئەکەین کە سەلام مەنمی زیرەکانە ئەو کێشەیە لە (شەن)ە کەیدا ئەخاتە ڕووو ژیانی جوتیارێکی کوردمان پیشان ئەدات کە بەرنگاری (ڕەشەبا) ئەبێتەوە وەك یەکێك لە هێزەکانی سروشت کە ڕێگای کارەکەی لێ ئەگرێ‌و لەشەن کردن دوای ئەخات ... «تارمی خەرمانەکەی بەست ... پشتی مالی ... ڕاستەو پواستەی گرت .. خۆی بۆ شەن کردن ئامادە کرد ... بەڵام ڕەشەبا لێی بوو بە مووی لووت ، بواری نەدا» ... ڕەنگە بەلای هەندێ خوێنەرەوە ئەم کێشەیە ساکار بێ‌و لەتوانایدا نەبێ بە تەواوی بیری چیرۆك نووسەکە بگەیێنێ ، ئەمە تا ڕادەیەك ڕاستە ، بەڵام توانو ـ لێهاتویی چیرۆك نووس لێرەدا دەوری خۆی ئەبینێ بەوەی کە دیاردە سادەو ساکارەکان بگەیێنێتە پۆپەو لە ڕوانگەیەکی ئەوتۆوە سەرنجی لێ بدات کە خوێنەر بۆی ناچێ . جا سەلام مەنمیش لێرەدا شارەزایانە هەنگاو بەرەو مەبەستەکەی هەڵئەگرێ‌و لە هەموو سوچێکی‌یەوە تێی ئەڕوانێ تا زیاتر بەرەنگار بونەوەی جوتیارەکەمان پیشان بدات دژی ڕەشەباکە ، ئەوەتا ڕۆژی یەکەم جوتیارەکە بە هیلاکی‌و ماندوێتی بەرەو مالەوە ئەباتەوە بێ ئەوەی بتوانێ ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێ کاری خۆی بکات ، پاش ئەوەی کە بە هیوای شەن کردنە وە ڕووی کردبووە خەرمانەکەی ، تەنانەت ڕۆژی دوایش نەك هەر ناتوانێ شەنەکەی بکات بەڵکو کە پرەکەشی بە سەرا ئەڕۆخێنێ و کونەو مەشکەکەی ئەکات بە ژێر گەڵاو گۆلەوەو جێگای چاوەڕێ کردنیشی پێ لەق ئەکات :

«بۆچی خۆیشم نابەی ؟! لەبن بەردەکەیشا وازم لێ ناهێنی ؟.».

دیارە ئەم گێرمەو کێشەیەش کار ئەکاتە سەر مرۆڤو گەلێ جار وای لێ ئەکات کە هیوا ببڕێ‌و خۆی بدا بە دەستەوەو سەر شۆڕ بکات بۆ ئەو هێزەی کە هەموو ڕێگایەکی لێ ئەتەنێ‌و لە شوێنی خۆیدا ئەیوەستێنێ کە لە چیرۆکەکەدا ئاتەی ژنی جوتیارەکە ئەبێتە نموونە بۆی‌و وورە بەرئەدات‌و نائومید ئەبێ لە ئەمانی ڕەشەباکە :

«بۆچی بەدەم ڕەشەباوەی نادەیت ؟» .

هەر لێرەوە چیرۆك نووس سەرەتای مەبەستەکەی دەخاتە ڕووو تیشکی بیرەکەی ـ ئەگەیێنێتە خوێنەرو بڕوا بونی بە مرۆڤو بەتوانای مرۆڤ لەوەی کە هەر ئەگاتە ئەنجام‌و سەرئەکوێ ئەخاتە ڕوو . جوتیارێك کە هەموو ڕۆژێ بە نائومێدی ئەگەڕێتەوەو کارەکەی بۆ ناکرێ ، هیواو ئاواتی هەر ئەمێنێ و خۆی نادا بە دەستەوە تەنانەت ئەگەر خەرمانەکەش لە کیس چێ کە سەرچاوەی دەرامەتی ژیانی یەتی :

«ئەگەر زوقمی زستان هەڵی تەکانلووە ، بە دەم ڕەشەباوەی نادەم ... شەماڵ هەر دێ ، ئیمرۆ سبەی ، سبەی نا دوو سبەی ..» .

بەم ڕەنگە چیرۆك نووس ئەو ئاوازە هێمنە ئەگەیێنێتە گوێمان کە ئاوازی کۆڵ نەدان‌و تێکۆشانی مرۆڤێکی کوردە دژی هێزێکی نالەبارو سەختی سروشت ، ئەو هێزەی کە چیرۆك نووس کردویەتی‌یە نموونەی هەموو ئەو ◁

هێزە خراپانەی کە دوژمنی مرۆڤن بە تایبەتی‌و کۆسپی ڕێگای ژیانو نەش‌و نماکردن‌و گەشەسەندنن بەگشتی .

«منیش خۆم پێ نەگیرا لە مەرەزەم پرسی : – ڕاستە بە ڕەشەبا گەشە ئەکەیت .. ؟

– من بە ئاو گەشە ئەکەم ، ئەویش ئاو کز ئەکات ... ئێستا بەزەیم بە مام (زەینەل)ی گۆخلا دێتەوە ... شەوو ڕۆژ خەریك بوو قولاخەی ئەبەست ... پاسە چۆلەکەو – سەرپاچی ئەکرد ... بەلام ڕەشەبا ڕەنجەکەی برد .

لە بالندەیشم پرسی :

– ئەلێن کە خۆت بەدەم ڕەشەباوە ئەدەیت بالەکانت پشوو ئەگرن ... ؟

– هە. ڕۆژێ ڕەشە بایێ بالەکانم شەکەتن ... هێلانەم ویرانە ، بەچکەکانم شپرزەن ... ئەوەی خۆمی بەدەمەوە ئەدەم شەمالە» .

هەلبژاردنی قارەمانی چیرۆکەکەش لە لایەن نووسەرەوە دیسانەوە پێویستی بەوە هەیە کە ئاوڕێکی لێ بدرێتەوەو هەول بدەین پەردە لەسەر مەبەستی چیرۆك نووس هەلبدەینەوە لەو هەلبژاردنەداو بکەینە وەلامی ئەو پرسیارەی کە دەپرسێ ئایا بۆچی جوتیارێکی کردووە بە قارەمانی چیرۆکەکەی نەك ئەندامی یەکێ لە چینەکانی تری کۆمەل ؟ ..

پێش هەموو شتێ وەك لەم چیرۆکەو لە چیرۆکەکانی تری سەلام مەنمی‌دا ئەوەی بەرچاو ئەکەون ئەوەیە کە نووسەر شارەزایی‌یەکی باشی لە ژیانی ڕۆژانەی جوتیاراندا هەیەو ئاگاداری هەلس‌و کەوت‌و جۆری ژیانی جوتیارانە ، کە ئەمەش ڕێگای ئەوەی – بۆخۆش ئەکات زیاتر بتوانێ لە خوێنەرەوە نزیك بێتەوەو دژواری‌و ڕووداوی نائاسایی‌و وەسفی دوور لە واقع لە چیرۆکەکانیدا سەر هەلنەدەن ، ئەمە لە لایەك ، – لە لایەکی ترەوە هەلبژاردنی جوتیارێك بۆ ئەوەی ببێتە نموونەی ئەبەزی‌و توانای دەسەلاتی مرۆڤ لە جیاتی یەکێکی تر زیاتر ئەو سفەتە ئەمرەی مرۆڤ دەرئەخات کە لە ناخی مرۆڤدایەو پەیوەندە بە لایەنی مرۆڤایەتی ئادەمیزادەوە ، دیارە جوتیارێك کە ئەندامێکی چینی هەژاری کۆمەلەو بڕ بڕەی پشتی گەلێکی وەك گەلەکەی ئێمەیە – نزیکترە لەوەی کە خاوەنی ئەو دلە گەورەیە بێ کە سەر ئەکەوێ بەسەر نائومێدی‌و بێ هوودەیی‌دا وەك لە ئەندامی یەکێ لە چینە بەرەو ژوورەکانی کۆمەل .

هەر ئەو شارەزایی‌یەی چیرۆك نووس لە جۆری هەلس‌و کەوت‌و ژیانی جوتیاراندا ئاسۆیەکی تری بۆ ئەکاتەوەو توانایەکی تری ئەداتێ لە دارشتنی چیرۆکەکەیدا . ئەبینین ئەو کێشەیەی کە لە نێوان ڕەشەباو جوتیارەکەدا سەر هەلئەداو وەك لەمەوپێش وتمان ڕەنگە لای هەندێ خوێنەر ساکار بێ ، بە هۆی جۆری دارشتنی ڕستەکانەوە ئەیکاتە دیمەنێکی کاریگەر کە خوێنەر ئەجولێنێ‌و وای لێ ئەکات هەنگاو لەگەل دیمەنەکاندا بێ‌و لێی دا نەبڕێ ، ئەمە جگە لەوەی کە هەندێ دیمەن ڕاستەو خۆ مەلبەندو ناوچەی ژیانی جوتیارەکەمان پیشان ئەدات

**فێرکردنی ئیلزامی دەوری دیاری ئافرەتی لەنێو کۆمەڵگەی سۆشیالیستیدا دووپاتی دەکاتەوە .**

بێ ئەوەی چیرۆك نووس پەنا بەرێتە بەر وەسفێکی ووردی ئەو شوێنە کە لە چیرۆکی کورت‌دا ئەو مەودایەی نی‌یە : «کلاوە لبادەکەی لەسەر کرد» .. لێرەدا هەست بەوە ئەکەین کە قارەمانی چیرۆکەکە جوتیارێکی ناوچەی – گەرمیانە ، چونکە زیاتر لەو ناوچانەدا جوتیاری کورد کلاوی لباد لەسەر ئەکات ، هەروەها کە قارەمانی چیرۆکەکە ئەلێ : «دەمێکە شنەت نیبە لێمان بوی بە هەنارە شیرینەکەی خاوێ –» دووبارە ئەمەش ئەبێتە پالپشتی بۆ چوونەکەی پێشومان بەو پێیەی کە هەنار یەکێکە لەو میوانەی کە لە ناوچەی گەرمیاندا کەمەو هەمیشە لەبەردەستدا نی‌یە . بەم جۆرە دەگەینە ئەو بڕیاردی کە ئەو سەرکەوتنەی سەلام مەنمی لە ناوەرۆکی چیرۆکەکەیدا بە دەستی هێناوە شێوەکەشی شان بەشانی ئەوە ستێ‌و لەیەك ناپچڕێن‌و لەسەر یەك هێلی سەرکەوتن ڕانەوەستن .

هیوادارم چیرۆك نووسەکانمان بەردەوام سیمفۆنی‌یەی سەرکەوتن‌و قارەمانی‌یەتی مرۆڤی کوردمان پێ بکەیێنن‌و چیرۆکەکانیان ئاوێنەیەکی ڕوونی ژیان‌و خواست‌و ئارەزوی گەلەکەمان بێت .

# دەزگاکانی ڕاگەیاندن و کۆمەڵانی خەڵک

□ ڕۆژنامە ...

□ ڕۆژنامەی کوردی «سەرنجێکی تێکرایی»

□ «هاوکاری» هەنگاوێکی پێشکەوتوو بۆ دروستکردنی ڕۆژنامەی کوردی

عبدالله عباس



## ووتەیەك :

لەدەمێکەوە ، خولیای ئەوەم لەسەردایە ، باسێکی تێروتەسەل دەربارەی (( **دەزگاکانی راگەیاندن و پەیوەندی ئەو دەزگایانە بەکۆمەڵانی خەڵکەوە** )) بە کوردی لەبەردەست هاوولاتی کورددا هەبێت ، ئەوەی هانی دەدام بۆ ئەم حەزە ، **یەکەم** : بەحوکمی ئەوەی لە دەمێ ساڵەوە لەم جۆرە دەزگایانەدا کار دەکەم و لەماوەی ئەم کارکردنەوە زیاتر دەرکم بە بایەخی ئەمجۆرە دەزگایانە کردوە ، کە تاچ رادەیەکی نزیك پەیوەندیان بەژیانی خەڵکەوە هەیەو تەئسیریان تا چ رادەیەکی گەورەیە لەرووی پێگەیاندن و بەرەو پێشەوە بردنی . **دووەم** : لەماوەی ئەم کارکردنەدا ، لەدەزگاکانی راگەیانداو بەپێی ئەوەی هەموو کەرەستەکانی راگەیاندنی هاوچەرخ کەم یان زۆر ئێستا دەگەنە لای کۆمەڵانی خەڵکی کوردو هەندێکیان بۆنەتە زادەی رۆژانەی بیرو هەست ، بەلام تەنیا گەیشتنەکەیە ، بەبێ شارەزایی لە ئەهمیەت و چۆنیەتی ، لەبەر ئەوە ، پێویستە شیکردنەوەی مەبەستی و ئەهمیەتی ئەم دەزگایانە بۆ خەڵك ئاشکرابێ .

ئەمڕۆش ، کە زۆر لایەنی رۆشنبیری گەلەکەمان لە چالاکیدایەو گەیاندن و خەملاندنی ئەنجامەکانی ئەو چالاکیانە ، ئەرکی دەزگاکانی راگەیاندنە ، زیاتر پێویستە خوێنەری کورد ، شارەزایی لەم دام و دەزگایانەدا هەبێت .

جا لەبەر رووناکی ئەوەی لەسەرەوە باسم کرد کەوتمە خۆ ، بۆ ئامادەکردنی ئەم باسە ، بێگومان ، ئامادەکردنی باسێکی وا ، نەك هەر ئاسان نیە ، بەڵکو ، هەر زۆر گرانیشە ، چونکە وەك لەسەرەتاوە دیاریم کرد ، باس و لێکولینەوەی بەم جۆرە بەزمانی کوردی نیە ، [**هەندێ چاپکراو دەربارەی رۆژنامە گەریەتی کوردی ـ وەك بەشێك لەبەشەکانی راگەیاندن ـ هەن کە منیش وەك سەرچاوە ، سوودم لێوەرگرتون ، بەلام باس و لێکولینەوەی رۆشنبیری و شیکردنەوە نین ، زیاتر بایەخ بە ژمارەو لایەنی مێژوویی دراوە**] . لەبەر ئەوە یەکەم متمانەم بەو سەرچاوانە کردوە لەم بارەیەوە نووسراون ، دووەم ئەو شارەزاییەی خۆم لەماوەی کارکردندا پەیدام کردوە ، کە دەتوانم بە شانازییەوە بڵێم ، شتێکی وای لێ دەزانم ، بەخۆما رابپەرموم خۆم لەباسێکی وا بدەم . لەپاڵ ئەمەشدا دەڵێم : ئەم هەولەی من ، تەنیا یەکەم هەنگاوە لەم رێبازەدا ، [**هەولدان بۆ شیکردنەوەو باسکردنی زانستی و رۆشنبیری دەربارەی بایەخی دەزگاکانی راگەیاندن**] .

لە دوایدا ، ئومێدەوارم . هەولەکەم جێگای رەزامەندی بێت و لە کەموکورتیەکانیشمان ببورن .

× × ×

## لێرەوە :

لایەنی راگەیاندن و رۆشنبیری لەولاتەکەماندا ، بایەخێکی بەرفراوانی پێدراوە ، بەجۆرێك ، شان بەشانی ئەو گۆڕانکاریە دەروات کە بەرەو دامەزراندنی کۆمەڵێکی نوێمان دەبات . لایەنی راگەیاندنیش ، بەکوردی، بەتایبەتی لەناوچەی کوردستاندا ، بەشێکی ئەو بایەخەی گرتۆتەوە ، تارادەی ئەوەی ئێستا ئینسانی کورد ، لە هەرسێ بەشەکەی راگەیاندنەوە «بیستراو»و «بینراو»و «خوێندنەوە» بەزمانی کوردی شتی فیکری و رۆشنبیری و قسەو باسی دەربارەی هەموولایەنەکانی تری ژیان پێدەگات .

لێرەوە ، شتێکی باشە ، رووناکی بخەینە سەر ئەم دەزگایانەی ، (**راگەیاندن**) یان پێدەوترێ و بزانین دەوریان لە خزمەتی جەماوەردا چیە ؟

× × ×

گومان لەوەدانیە ، کە دەزگاکانی راگەیاندن ، دەورێکی گەورە ، لە کارتێکردنی بیرو باوەڕی خەڵکیدا دەگێڕن و ئەم دەورەش ، لەشەڕو لەئاشتیدا ، لەوەستان و کارکردندا لەبنیاتنان و روخاندنداو لە هەر باروو زروفێکدا بێت ، ئەوا ئەو دەزگایانە مەسئولن لەپێگەیاندنی شەخسیەتی کۆمەڵ و ئەرکی گەیاندنی فیکری ، لەناو ئەو کۆمەڵەدا ، بەڕادەی رووداوەکانی ئەو زروفەی تیێدا دەژی و ئەم پێگەیاندنەش ، بە هەردوو لایەنی لەبارو نالەبار (سەلبی و ئیجابیدا) لە ئەستۆی ئەو دەزگایانەیە .

× × ×

لەگەڵ گۆڕانی شارستانیەتی بەستراو بە ژیانی مرۆڤەوەو ئەو پێشکەوتنەی لە مەیدانەکانی تەکنیك و زانستدا بەدی هاتوون ، ئاسان نیە ، مرۆڤیش لە

مەوقیمەکانی ژیانی ئاسایەوە بگەبەنرێنە مەوقیمەکانی نوێی شانبەشان پێشکەوتنی تەکنیك بەشێوەیەکی میکانیکیوا هەروەك بەنیسبەت گۆڕانی ئالەتیکیوە روو دەدات ، جا بۆ ئەوەی رێ بردنی مرۆڤی هاوچەرخ بەشتەکانی دەوروپشتی ، لەگەل ئاسۆی فیکریو هەلسوکەوتی رۆژانەیدا شانبەشانی ئەو شتە ئالیانە بروات ، کە کاری تێدەکەنو ئەم لەهەلسو کەوتی رۆژانەیداپەیوەندی لەگەلیانا هەیە ، پەرەدان بەو کەرەستانە هاتۆتە کایەوە کە کەکاردەکەنە سەر درووست بوونی سایکۆلوجیو رەفتاری مرۆڤ لەکۆمەلداو لەپاڵ گۆرانو پێشکەوتنی خێرایی تەکنیكو زانستدا پێشیدەخەن . ئەو کەرەستانەش دەزگاکانی راگەیاندن پێکدەهێن کە دەبێ بۆ بەدی هێنانی پیکەوەبەستراوی پێشکەوتنی «ئالەت» کە لەخزمەتی مرۆڤدایە ، رووناك بیری مرۆڤیش بۆ قبول کردنی ئەوپێشکەوتنە زامن بکات .

× × ×

× × لە سەرەتادا ، بزانین دەزگاکانی راگەیاندن کامانەن :

**دەزگاکانی راگەیاندن بریتین لە :**

**× × ئەوەی دەبیسترێ .**

**× × ئەوەی دەبینرێ .**

**× × ئەوەی دەخوێندرێتەوە .**

ئەوەی دەبیسترێ ، مەبەست لە «رادیو»یەو ئەوەی دەبینرێ ، تەلەفزیونو سینەماو شانۆو هونەری تەشکیلی دەگرێتەوە ، ئەوەی دەخوێندرێتەوە ، رۆژنامەو گۆڤارو بەرهەمی چاپکراوی دەزگا چاپەمەنیەکان دەگرێتەوە ، هەریەکی لەم دەزگایانە بەتەنیاو هەموویان بەیەکەوە ، لەرووی ئەرکی راگەیاندنو تەئسیریان ، لەیەك ئاستدان ، لەگەل جیاوازی درەنگو زوویی گەیاندنی ئەو تەئسیرە ، بەلام لەهیچ باروو زروفێکدا ، ناتوانرێ دەست لە هیچیەکێکیان هەلبگیرێ ، تەنیا لەکاتێکدا هەست بەجیاوازی ئەهمیەتی ئەم دەزگایانە دەکرێ ، کە سەرنجی ئەوە بدەین ، کامیان زیاتر لە خەلك نزیکنو پەیوەندی زیاتریان بە خەلکەوە هەیە ، لەم رووەوە ، ئەوەی دەبیسترێو دەبینرێ ئەهمیەتی لەوە زیاترە کە دەخوێندرێتەوە ، بۆچی ؟ چونکە ئەوەی دەبیسترێو دەبینرێ خێراتر دەگاتە لای خەلکی .

× × ×



هەر مەسەلەیەك ، بوبسترێ ، لەرێگای دەزگای راگەیاندنەوە ، بگەینرێتە خەلك ، پێویستە ، پێشەکی ئەم مەرجانەی خوارەوەی بۆ زامن کرابێت ، بۆ ئەوەی گەیاندنەکە مەبەستی راستی خۆی بەدەستەوە بدات .

**ـ باوەرپێ بوون :**

مەبەست لەوەیە ، ئەو خەلکەی مەسەلەیەکی لەدەزگایەکی راگەیاندنەوە پێدەگا ، پێویستە ، پێشەکی ، باوەر بوونی بە دەزگاکە زامن کرابێ ، کەواتە بوونی گیانی باوەڕ پێکردن لەنێوان دەزگای راگەندنو خەلكدا مەرجێکی گرنگە بۆ تەئسیری ئەو دەزگایە لە بلاوکردنەوەکانیا بۆخەلکی .

ـ ئەو دەزگایەی هەبوونی باوەڕ پێبوونی خەلکی زامن کردوە ، پێویستە وەختو شتومەکی بلاوکراوەکانی ، بەنزیکی لە هەستو نەفسیەتی مرۆڤایەتیو کۆمەلایەتیو فیکریو زروفی ژیانی ئەو خەلکە هەلبژێری . بەم دوو مەرجە گەیاندن لەلایەن دەزگاکەوەو قبول کردن لەلایەن خەلکەوە بەچاکی دەرواتو ئەنجامیش باش دەبێ .

× × ×

### رادیوو تەلەفزیون :

هەرچەندە ، تەلەفزیون ، سەبارەت بە خەڵکی کوردستان نوێیەو ماوەیەکی ئەوەندەنی‌یە ، خۆی گەیاندۆتە ماڵی خێزانەکانی ئەم ناوچەیە بەڵام رادیۆ ، لەلای خەڵکی‌لای ئێمە دەمێکە ناسراوە ، رادیۆ ، یەکێکە لەو دەزگا راگەیاندنانەی پەیوەندی راستەوخۆی لەگەڵ خەڵکدا هەیە ، بۆیە پێویستە زیاتر بایەخ بەوە بدرێ بەزمانی ئەوانەوە بدوێ‌و هەر بەرنامەیەك ئاراستەی دەکا ئەوەی تێدا رەچاو بکری کە : هەمەرەنگ کردنی ئەو بەرنامەیە لەپێشەوەی مەرجەکانی سەرکەوتنیەتی ، ئەویش بۆ لەناوبردنی گیانی بێزاری‌و وەرس‌بوون لەناو خەڵکدا ، باشترین بەرنامە لەم روەوە پێشکەش بکرێ، دەبێت مەسەلەی پەیوەندی بەئارەزووی ئینسانیەتەوە لە هەموو رووەکانیەوە لەبیر نەکات‌و ئەمەش رێڕەوی ئاشکرای راگەیاندنی نوێیە لەهەموو ئیستگەکانی رادیۆ پێشکەوتوەکاندا کە بەراستی ئەرکی خزمەت کردنی خەڵك رەچاو دەکەن .

هەموو کەسێك ، لەناو هەر کۆمەڵێکدا ، بەدوو شتی سەرەکی پێ‌دەگا ، بیرو سەرنج‌و هەڵسەنگاندنی ئەو بیرە ، پێ‌گەیاندنی ئەم شتانەش لەرێگای دەزگاکانی راگەیاندنەوە دەبێ ، کە رادیۆو تەلەفزیون دوو بەشی هەرە گرنگی ئەو دەزگایانەن ، جا لەبەر رووناکی ئەم راستی‌یەدا ، پێویستە سەرنج لە بایەخی رادیوو تەلەفزیون بدرێ ، لە وڵاتانی تازە پێ‌گەیشتودا لەرووی دەوری دەزگاکانی راگەیاندنەوە بۆ پەروەردەکردنی خەڵك رادیۆو تەلەفزیون دەوری زیاتر دەگێڕن‌و لەم رووەوە بەر لە ئەهمیەنی‌راگەیاندنی «خوێنراوە» دێن چونکە راستەوخۆ دەگەنە خەڵك .

× × ×

### شانۆ :

شانۆ ، کە یەکێکە لە لایەنە گرنگەکانی راگەیاندنی‌بینراو بایەخەکەی لەوەدایە ، پەیوەندی راستەوخۆی بەخەڵکەوە هەیە زیاتر لە بەشەکانی تری راگەیاندن راستەوخۆ قسە لەگەڵ خەڵکدا دەکا ، جا بۆیە ، کارنێ‌کردنی شانۆ ، بۆسەر خەڵك خێراترەو هەر بۆیەش لەوڵاتە پێش کەوتوەکانی دنیادا ، بایەخێکی زۆر بە پەرەپێدانی ئەم بەشە گرنگەی راگەیاندن دەردێ‌و تەقەللای پێشخستنی‌و پەرەپێدانی دەدری ، تا بگاتە رادەیەك ، زیاتر لە خەڵك‌و بۆ خەڵك بێ ، لەو شێوە نوی‌یانەی ئەهمیەتی شانۆی راستەوخۆ دەنوێنێ‌و وەك پێویستیەکی راگەیاندن ئەرکی خۆی لەرێگایەوە بەجێ دەگەیەنێ ، ئەو شێوازە تازەیەیە کە راستەوخۆ لەناو خەڵکدا شانویی دەنوێنرێ باسەکانیش کە لەسەر شانۆ پێشکەش ددکرێن ، کاروکێشەکانی ژیانی خەڵکی چارە سەر دەکەن لەپاڵ بایەخدان بە چوارچێوەی هونەری رەسەنی سەربەمیللەتدا .

× × ×

## رۆژنامە :

### سەرەتا :

رۆژنامەش ، وەسیلەیەکی گرنگی تری راگەیاندنەوکاری گەورە دەکاتە سەر گۆڕانی کۆمەڵ‌و پێشکەوتنی ، هەروەك لە دواخستنی‌و خەریك کردنیان بەشتی نابووتەوە دەور دەگێڕێ .

رۆژنامە ، چەکێکی گرنگی ئایدولوژی‌یە ، بە هەردوو لایەندا ، دەتوانرێ ، **بۆ خزمەتی ئامانجەکانی دوژمنانی گەل بەکار بهێنرێ** ، هەروەك چاکترین وەسیلەی ئاراستە کردن‌و پەروەردەکردنیەتی ، جا بۆ ناسینی رێڕەوی ئاشکرای هەر رۆژنامەیەك ، پێویستە سەرنجی ناوەرۆکی بدرێ کە ناوەرۆك ئەو مەبەستە دەدات بەدەستەوە .

لەرێگای رژنامەوە ، رووداوەکانی ناوخۆو دنیا دەخرێنە بەرچاوی خوێنەر ، لەبەر ئەوە ، شێوازی بەرچاوخستنی رووداواکانیش رێرەوی رۆژنامە ئاشکرادەکا . بۆیە بایەخدان بە ناوەرۆکی مرۆڤایەتی‌و بەگژدا چونی کۆنەپەرستی‌و فیکری بورجوازی‌و ورە بەردان لەسەرەوەی ئەرکەکانی رۆژنامەی پێشکەوتنخوازە ، چاکترین رۆژنامەش لەم رۆژگارەدا، کە بیەوێ بەراستی رێڕەوی سەر بەفیکری پێشکەوتنخوازانەی خۆی دیاری بکا، ئەو رۆژنامەیەیە، کەباری سەرنجی نەتەوەیی‌و دیموکراتی‌و پێشکەوتنخوازی تێکەڵ بە بیروباوەری مرۆڤایەتی دەکاو دەتوانێ پەیوەندی لەگەڵ خەڵك‌و کاروبارو

سودو خواستەکانیدا بەهێز بکا .

ڕۆژنامە ، ئەرکی سەرشانیەتی بیروباوەڕو خواستو بۆچونەکانی ناحەزەکانی سوودی خەڵك بپوکێنێتەوە ، ئەو بۆچونە هەڵەیەی کە دەڵێ گوایە ڕۆژنامە کارگەیەکی پیشەسازییەو مەبەست لەبوونی قازانجی ماددیە .

× × ×

– ١ –

مەسەلەی مێژووی داهاتنی ڕۆژنامە ، وەك کەرەستەیەکی ڕاگەیاندن ، دیاری کردنی ئاسا نیە ، چونکە ، هەروەك هەموو لقەکانی تری مێژووی گشتی: ئەدەبو ڕووداوەکانی ئابووریو بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی، ناتوانرێ بەبێ گەڕانەوە ، بۆ گۆڕانکاریە گشتییەکانی ناو کۆمەڵی مرۆڤایەتی دروست بکرێو بکاتە ئەنجام ، جا ڕۆژنامە زیاتر لە هەموو باسو مەسەلە مێژوویەکانی تر پەیوەندی بەباری سیاسیو حاڵەتی ئابووریو باری کۆمەڵایەتیو ڕادەی ڕۆشنبیری ناو ئەو وڵاتەوە هەیە کە ڕۆژنامە دەنگ دانەوەی ئەوبارەیە .

ئەگەر ئاسانبێ ، لە هەر جۆرێ لەجۆرەکانی شارستانیەتداو لەناو هەموو کۆمەڵەکاندا ، یەکەم هەنگاو بۆ دەرچونی ڕۆژنامە دیاری بکرێ ، بەڵام دروست بوونی ڕۆژنامە ، بەمانا تێکڕاییەکەی ، کەراستەوخۆ دەوری وەك کەرەستەیەکی ڕاگەیاندن هەبووبێ ئاسان نیە ، ڕووداوەکانی دنیاو پێویستی نوێی ڕاگەیاندن ، زۆر داهاتیان هێنایە کایەوە ، یەکی لە پێویستیەکانی ئارەزووی ئینسان، لەم گۆڕانکاریەدا، حەزی بووە لە بەدوادا گەڕانی «هەواڵ»دا ، لەبەر ئەوە ، لەسەدەی نۆزدەهەمدا ، خاوەن چاپخانەکان کەوتنە چاپکردنی دەفتەری بچوك ، بە چوار یان شەش یان هەشت لاپەڕە کە هەواڵو دەنگوباسیان تێدا بڵاو دەکردەوە ، ئەگەر هەندێ هەواڵ پێویستی بە ڕوون کردنەوە بووایە بۆ تێگەیاندن ، ئەوا ڕەسمیان لەسەر تەختە بۆ هەڵدەکۆڵیو لەگەڵ هەواڵەکەدا بڵاویان دەکردەوە ، ئەم چاپکراوانە ، وەك وتمان ، دەرگایان لەبەردەم داهێنانێکی زۆر گەورەدا کردەوە ، کە لە دنیای ئەمڕۆماندا گەورەترین دەور لە گۆڕانکاریی شارستانیەتی مرۆڤدا دەگێڕێو ئەویش **«ڕۆژنامە»ی** ئێستایە .



– ٢ –

**زۆر جار ، بەبیردا دێ ، ئایا ماهیەتی ڕۆژنامە** چیە ؟ ئایا وەزیفەیەکی کۆمەڵایەتیە ؟ بۆ وەڵام دەڵێین : ڕۆژنامە وەزیفەیەکی کۆمەڵایەتی بەرزو پیرۆزەو ئامانجی ئاراستە کردنی ڕای گشتییە لەڕێگای بڵاوکراوە ڕاگەیاندنەکانیەوە ، ئەو کەسەیشی لەم وەزیفەیەدا کار دەکا. تێکەڵ بەکاری هونەرو ئەرکو پیشەیەکی پیرۆزی مرۆڤایەتیە ، کە پێویستیبە داهێنانو زیرەکیو بیر فراوانیە .

– ٣ –

ڕاگەیاندنو ئاراستەکردن لە ڕێگای ڕۆژنامەوە ، تەنیا بە دەنگوباسو گەیاندنی هەواڵ نابێ ، بۆ ئەوەی ڕۆژنامە ئەرکی خۆی بەتەواوی بەجێبهێنێ ، هەتا ڕۆژانەکان بە ڕۆشنبیریو زانستو بایەخدان بە کاروباری ڕۆژانەی خەڵکەوە خۆیان خەریك دەکەن .

ئەم گۆڕانەی لە مێژووی پێشکەوتنی ڕۆژنامەدا ڕوویدا، کە وەك لەسەرەتاوەو تمان گەیاندنی «هەواڵ» دروستی کردو دوایی پێویستیەکانی تری کۆمەڵایەتی تێکەڵ بوون ، تا وای لێهات بایەخی لە تەنیا «هەواڵ»

گەیاندن فراوانتر بێ ، هونەری رۆژنامەی وەك هەموو هونەرەکانی تر لەگەڵ گۆڕانـەکانی رۆژگاردا بـەرەو ئەوە برد لەئوسلوبێکەو ، بەرەو هی‌تر بگۆڕێ‌و لـەم گۆڕانەشـدا متمانە بە لێ‌هاتویی‌و توانای داهێنـانی هونەرمەندانەی مرۆڤ کراوە .

× × ×

## رۆژنامەو جۆرەکانی :

— ١ —

**سەرەتا :**

بێگومان ، تەقەللای فێرکردن، دەبێ بە مەبەستی دروست کردن یان پێ‌گەیاندنی مرۆڤی نوێ‌بێ ، مرۆڤی نوێی خاوەن بیری رووناکی نوێ ، کە ئەرکی نوێی لەسەرشـــانەو لەگەڵ پێشـــکەوتنی شارستانیەتی هاوچەرخدا دەگونجێ ، بەدی هێنان ، یان بە ئەنجام گەیاندنی ئەم تەقەللایـــە وەختێکی زۆری دەوێتو ، پێویستی سەرەکی بۆ ئەم مەبەســتە ، ئە پەرەپێدانی کۆمەڵدا ، کار کردنە بۆ ئەوەی خەڵك ، هەریەکە لەلای خۆیەوە ، هەوڵی پێ‌گەیاندنی خۆی بدات .

بۆ ئەوەی رێگا لەبەردەم خەڵکـدا بکرێتەوە ، خۆی پێ‌بگـــەیەنێ‌و پێشکەوێ ، رۆژنامە ، یەکێکـە لە وەسیلەکانی دەست خەڵك بۆ خۆ پێ‌گەیاندن .

کە رۆژنامە ئەم وەسیلە گەورەیەی دەستی خەڵك بێ بۆ پی‌گەیشـــتن‌و تێ‌گـەیشـــتنی ، کەواتـــە رۆژنامـــەنووســـی بریتی‌یـــە لـــە : هونـــەری گۆڕینی رووداوو بیرو شارەزایی‌و کاروبارەکانی مرۆڤایەتی‌و دیاردەکانی گـــەردونو ژیان ، بەماددەی چاپکراوی ئاســـان بۆ تێ‌گەیشـــتن : لـەلای رۆشـــنبیریکی زۆر زیرەك‌و خاوەن بیریکی مام ناونـــدی‌و خوێنەوارێکی ئاسایی .

**لێرەوە دەتوانین بلێین رۆژنامە : بەشداری‌یەکی ویژدانی‌و فیکری‌یە لە کۆڕی مرۆڤایەتیدا ، نووسەری رۆژنامەو خوێنەر بەیەکەوە دەبەستێ .**

رۆژنامە ، بەهەموو شێوەکانیەوە [ئەو گۆڤارانە نەبێ کە بۆلایەنێکی دیاری کراوی زانستی‌و فەلسەفی تەرخانبوە ... هتد] دەبێ بەپێی ئەم مەرجانە ئـەو پەیوەنـــدیە ویژدانیـــە مرۆڤایەتیە لەنێوان خـۆی‌و خوێنەرەکانیا دروست بکات :

**یەکەم :** تێ‌گەیاندن .

**دووەم :** ئاگاداری خوێنەر لـەو شـتانەی لـە دەورووپشتی روو دەدەن .

**سێیەم :** راکێشانی خوێنەر بۆ خوێندنەوە .

**چوارەم :** کارتێ کردن ، رازی کردن ، رابەریی‌و ئاراستەیی .

× × ×

— ٢ —

ئەوەی کە لەپێشەوە باسمان کرد ، چوارچێوەی تێکرایی رۆژنامەو ئەرکی رۆژنامەیەو پەیوەندی لەنێوان رۆژنامەو خوێنەوارداو چوارچێوەیەکی تێکرایـــە ، رۆژنامە بەگشتی دەگرێتـــەوە ، بەلام رۆژنامە ، لەپاڵ ئـەو چوارچێوە تێکرایـــەی ئەرك‌و چۆنیـــەتی ئاراستەکردنیدا ، یەك جۆر نیە ، رۆژنامەی رۆژانـــە هەیە ، وەك دەزانین ، هەروەها هەفتانەو دیســـان گۆڤاری هەفتانەو مانگانە هەیە ، بێجگـــە لە گۆڤاری تایبەت بە شارەزایی دیاری کراوەوە ، وەك گۆڤاریکی تایبـــەتی کـە تەنیا بایەخ بە زانســـت دەدات ، یان رۆژنامەیەکی هەفتانە تەنیـــا بۆ کاروباری وەرزش تەرخانـــە ، یان گۆڤاریك تایبـــەتە بـە کاروباری ئابوریەوە ، یان تەنیـــا بۆ ئەدەب‌و لقـــەکانی ئەدەب‌و رۆشنبیری‌و تادوایی ... هەتا ئەم گۆڤارو رۆژنامانە ، لـەرووی ئاراســـتەو راگەیانـــدن‌و هونـــەری رۆژنامەگـەریـەوە ئـەو چوارچێوە فیکرایـە دەیان گرێتەوە کە باسمان کرد . هەر چەند ، تەرخانیشـــن بۆ بەشێکی تایبەت لە خوێنەوار .

ئەوەی ئێمە لێرە مەبەستمانەو دەمانەوێ هەندێ لە بارەیەوە بدوێین‌و باسی‌بکەین ، رۆژانەو هەفتانەیە.

لەم بارەیـــەوە دەڵێین : لـەنێوان رۆژنامـەی رۆژانەو هەفتانەدا ، جیاوازیەکی زۆرکەم‌و ســـاکار هەیە ، بەڵام هەندێ شارەزا ئەم جیاوازیە ساکارەیەش بەدی ناکەن‌و دەڵێین رۆژنامە هەموو نوسین‌و کاغەزو مەرەکەب‌و چاپخانەو کارکردنـە لەماوەیانـەوە کاربۆ ئاراستە کردن‌و راگەیاندن دەکرێ . هەندی دەڵێن : رۆژنامەی رۆژانە شتێکەو هەفتانە شتێکی ترە ، بەڵام بەلای هەندێکـــەوە وایە ئەگەر جیاوازی لـە جۆرو

شێوەو وەختدا هەیێ ، بەڵام هەردووکیان لەئەنجامدا یەکن ، هەردووکیان «راگەیاندن» یان لەئەستۆیە .

هەرچۆنێك بێ ، راستیەك هەیە ساغ بۆتەوە ، ئەویش ئەوەیە : رۆژنامەی رۆژانە لەکاری ئاراستەکردنو راگەیاندندا دەبێ متمانە بە خێراییو دەستو بردی بکاتو رۆژنامەی هەفتانە زیاتر بایەخ بەلێکولینەوەو شیکردنەوە دەدات ، هەتا لەرووی «هەواڵو دەنگوباسیشەوە» بێجگە لەوەی زیاتر ماوەی ئەوەی تێیدایە بایەخ بە لێکولینەوەی روشنبیریو هونەری بدات .

بەڵام هەتا ئەم لایەنەش کە وەك جیاوازی لەنێوان رۆژنامەی هەفتانەو رۆژانەدا دەردەکەوێ ، ئێستا کەمتر دەبینرێ ، چۆن ؟ لەدوای پێشکەوتنی دەزگاکانی راگەیاندن ، کە لەسەرەتادا ، رۆژنامە ، بایەخی هەرە سەرەکی بە گەیاندنی هەواڵ دەدا ، پەیدابوونی رادیۆو تەلەفزیۆن بەو شێوە پێشکەوتوەی ئێستا هەیە ، وای کرد خەڵکی لەسەر چاوەیەکی تر خێراترەوە هەواڵیان پێبگات ، لەبەر ئەوە رۆژنامە رۆژانەکانیش بۆ مانەوەی رەواجیان لەناو خوێنەردا روویان کردە پەرەپێدانی لاپەرەی تایبەت بەلێکولینەوە ئەدەبیو سینەماو کاروباری رۆژانەی ژیانی خەڵك .

x x x

— ٥ —

«هەواڵ» یان دەنگوباس ، لەرۆژنامەدا ، دەورێکی گەورە دەگێری ، هەروەك لەسەرەتاشدا دەستمان بۆ ئەوە راکێشا ، لەسەرەتادا ، بۆ پێویستی گەیاندنی «هەواڵ» بەخەڵکی شتێ دروست بوو ، ناونرا رۆژنامە . بەم پێیە ، لەرووی پیشەوە لەرۆژنامەدا ، شارەزاو بزوێنەری دەورگێر ئەوەیە کە ئەهمیەتو چۆنیەی گەیاندنی هەواڵ بەخوێنەر دەزانێ . هەر بۆیەش ، ناسراوترین کەس لەرۆژنامەدا «هەواڵ» دەربوە تادوایی ئەم پیشەیە ئەوەندە فراوان بوو ، رۆژنامە نووس چوارچێوەی دیاری کردنی پیشەکەی لەوەوە دەست پێدەکا ئەم سیفاتانەی تێدابێ :

— شارەزایی لەپیشەکە : لە توانایدابێ کە ئەوەی بە «خاوی» وەری دەگری ، بەشێوەیەکی قبوڵ کراو بیگەیەنێتە خوێنەر .

**— شارەزایی لە بیروبڵاوەی خزمەت گوزاری گشتیدا هەبێ .**

**— پابەند بوون بە هاندەری ئاکاریانەوە .**

**— خۆشویستنی پیشەی گەران بەدوای هێلاکیدا .**

ئەو نووسەرەی ، ئەم سیفەتانەی تێدا دەبێ ، رۆژنامە نووسێکی سەرکەوتوەو دەتوانێ ئەرکی سەرشانی لە رۆژنامەیەکدا بەجێبهێنێ ، بردی باوەر لەنێوان خۆیو رۆژنامەکەیو خوێنەردا دروست بکا .

x x x

بێینەوە سەر باسی «هەواڵ»و دەوری لە پێشخستنی رۆژنامەدا .

جارێ شارەزاکان زۆر «وەسف»یان بۆ «هەواڵ» داناوە ، هەیە دەڵێ :

— هەواڵ : بریتییە لە گەیاندنی هەندی لایەنی چالاکی مرۆڤایەتی کە لای رای گشتی بایەخی هەیەو بەگەیاندنی بەخەڵك شارەزاییان زیاد دەبێو شتی نوێ فێر دەبن .

— یان دەڵێین : هەواڵ ، ئەوەیە خەڵك ، دەماو دەم دەیگێرنەوەو لەسەری دەدوێنو ئەو هەواڵەی زیاتر قسەی لەسەر بکرێ ، بایەخی زیاترەو قسەو گفتوگوش دەگاتە رادەی لێکولینەوەو بێنەو بەرەی کە شارەزایی خەڵك زیاد دەکا .

— سەیر ترین باسی هەواڵ : وشەی «هەواڵ» بەئینگلیزی « News » کە لەچوار پیت پێك هاتوە هەرپیتێکی یەکەموشەی هەر چوار لای دنیایە ، سەرو « East » و رۆژهەلات « North » و رۆژئاوا « South » و خواروو « West » « ، جا بەم چۆرە «هەواڵ» واباس دەکرێ ، گەیاندنی رووی راستی ئەو هەڵسو کەوتەیە لە هەمولایەکی دنیادا روو دەدا .

هەواڵ دەری رۆژنامە ، بەشارەزاو مێژوو نووسێکی بیر فراوان ، باسکراوە ، بەڵام بە پەلە دەنووسێتو متمانە بە بیرتیژی خۆی دەکا لە گەورەکردن یان بچوك کردنەوەی رووداوەکانداو بەپێی ئەمە ، دەبێ رۆژنامەنووس شارەزایی لەزانستی نەفسی (سایکولوجی‌دا) هەبێو بزانێ چۆنو لەکوێدا دەتوانێ کار بکاتە سەر خوێنەر .

گەیاندنی هەواڵ هەموو وەك یەك نیەو بەپێی وەسیلەی گەیاندنەکەی دەگۆرێ : هەواڵی رۆژنامە ، دروستکردنیو رێکخستنی جیایە لە هەواڵی رادیۆو تەلەفزیون .

## چۆن هەواڵ دەنووسرێ ؟

ساغ بۆتەوەکە ، هەواڵ وەڵامی پێنج پرسیارەیە : (کێ)و (کەی)و (لەکوێ)و (چۆن)و (بۆچی) دەست پێدەکاو لەزانستی رۆژنامەدا ناونراون «پرسیارە نەمرەکان» ، بێگومان ریز کردنی پرسیارەکان ، لە نووسینەوەی هەواڵ دا ، مەرجنیە یەك لە دوای یەکدا بێ ، دەتوانرێ ، پرسیاری «بۆچی» یەکەم بێو «کەی»یان «لەکوێ» دوایر سیاربن .

**نموونە :**

[یەکێتی نووسەرانی کورد ، لە سلیمانی ، ئێوارەی چوار شەممە ، کۆڕێکی رۆژشنبیری بۆ یادی شاعیری نەمری کورد «پیرە مێرد» سازکرد] .

**پرسیارەکان :**

١ ــ کێ کۆڕەکەی سازکرد ؟ یەکێتی نووسەرانی کورد
٢ ــ کۆڕێکی «چۆن» بوو ؟ رۆشنبیری .
٣ ــ کەی بوو ؟ چوار شەممە .
٤ ــ لەکوێ بوو ؟ سلیمانی .
٥ ــ بۆچی بوو ؟ بۆ یادی پیرو مێرد .

× × ×

## رۆژنامەی کوردی

ئەوەندەی وەك نووسراوەو پەیوەندی بە مێژووی رۆژنامەگەری کوردیەوە هەیە ، راستە دەرچوونی یەکەم رۆژنامە بە کوردی لە «٢٢ی نیسانی ١٨٩٨»دا بەناوی «کوردستان»ە وەبوە ، بەڵام ، وەك پیشەو لێگەیشتن لە ئەهمیەتی ئەو پیشەیەو بەکارهێنانی وەك هونەرێکی راگەیاندن بۆ سوودی مێژوویی‌و باری سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری‌و دەوری لە پێشخستنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی پێشکەوتنخوازانەی گەلی کورددا ، ئەوەندەی مێژووی دەرچوونی یەکەم رۆژنامە کە خۆی کۆن نیە ، کە ئەمەش لە خۆیدا پەیوەندی بە باری سیاسی‌و تێکۆشانی گەلەکەمانەوە هەیە ، رووکردنە رێگای نوێ لەبەرەو ئامانج لەتێکۆشانی گەلی کوردا لەسەر رێبازی پێشکەوتخوازانەی نەتەوەیی کراوە بەسەر هاوشانی لەگەڵ تێکۆشانی گەلانی ناوچەکەدا دەرگای لەبەردەم ئەم هونەرەشدا کردەوەوشان بەشانی تێکۆشانی بۆ زامن‌کردنی مافی رەوای خۆی بڕوات .

ئەوەندەی ئەمانەت‌و راستگۆی لەباسی وادا فەرزی دەکات ، دەبێ خۆمان لە تەنیا دانە دەست تەوژمی سۆزو عاتفە دوور بخەینەوە ؛ ئەگەر لە هەموو دنیادا ، داهاتنی رۆژنامە ، بەنیسبەت داهاتەکانی تری شارستانیەتی مرۆڤایەتیەوە ، تازەیە، ئەوا بەنیسبەت ئێمەوە ، هەر گەلێك تازەیە ، ئەمە ئەگەر بمانەوێ ، رۆژنامە وەك پیشەو وەك ئەنجامی ئەو پیشەیە بەیەکەوە بەرچاو بخەین ، کە من لێرەدا ئەمەیانم مەبەست ترە ، چونکە ئەگەر تەنیا سەرنجی لایەنی بوون ، بەبێ لایەنەکەی تر بدەین ، ئەوا بەتەواوی گەلی کورد لە «٢٢ی نیسانی ١٨٩٨»وە رۆژنامەی ناسیوە . بەڵام وەك بیشەیەکی راگەیاندنی هاوچەرخ بەپێ گەیشتویی‌و دەست پێکردن لەسەرەتاوە ، ئەوا گەیاندنی ئەم لایەنەی راگەیاندن بە ناو بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد وەك یەکەم هەنگاو دەگەڕێتەوە بۆ «حسین حوزنی موکریانی»ی نەمرو «پیرەمێرد» . کە لە ساڵەکانی ١٩١٤وە دەست پێدەکاتو لەلای پیرەمێرد لە سەرەتای بیستەکانەوە دەست پێدەکا .

ئەم دوو گەورەیە رۆژنامەیان بەجۆرێ گەیاندە کوردستانو بەمرۆڤی کوردیان ناساند ، پێداویستی‌یەکانی ئەوەیان لەگەڵ هێنا کە رۆژنامە شتێکی کوت‌و پڕو بۆ وەختێکی دیاری‌کراو نەبێ ، بەڵکو خەڵکی کورد بەئوسلوبێکی نوێ لە ئوسلوبەکانی تێکۆشانی رەوای خۆیدا وەك کەرەستەیەکی زیندوی هاوچەرخی ناسی .

کە دەگەڕێینەوە سەر مێژوور ئەم هونەرە هاوچەرخەی راگەیاندن لەلای کورد ، بۆمان دەردەکەوێ کە چۆن خوالێخۆشبو حسین حوزنی موکریانی لە دار کلێشەی ناو دارانی کوردی هەڵدەکۆڵی‌و لاپەڕەکانی [زاری کرمانجی]پێ دەرازاندەوە ، پیرەمێرد ی نەمر چۆن لەماوەی «زیانەوە»و «ژیان»و «ژین»ەوە خەڵکی بەوە رادەهێنا لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەکان هەست بە شتە رۆژانەکانی خۆیان بکەن‌و بەزمانی ئەوانەوە قسەی دەکرد .

لەوساڵەوە ، ئیتر تەقەللا بەردەوام بووە ، بۆ بەرەپێدانی رۆژنامەی کوردی ، گۆڤاری «گەلاوێژ» لەرووی ئاراستەیی‌و رەچاوکردنی پێداویستەکانی کاری رۆژنامەگەری سیاسی‌و رۆژشنبیری‌و زانستی،

بەنیسبەت ئەو وەختەوە ، شان بەشانی گۆڤارو ڕۆژنامە باشەکانی ئەوسای هەموو ناوچەکە بووە ، ئەم گۆڤارە نەك هەر لەو بارانەوە خزمەی مرۆڤی کوردی کرد ، بەڵکو دەبێ دەست بۆ ئەوەش بکێشین کە لەگەیاندنی ڕووداوە بەرەو پێشکەوتنەکانی ژیانی مرۆڤایەتی لە هەموو دنیادا بە خوێنەری کورد لەرێگای وەرگێرانەوە بۆسەر زمانی کوردی دەورێکی زۆر باشی گێرا .

بێگومان ، وەك لەسەرەتای باسەکەماندا و لە شیکردنەوەی باسی ڕۆژنامەدا دەستمان بۆ ئەوە ڕاکێشا ، کە گەشەسەندنی ئەم لایەنەی ڕاگەیاندن لەهەموو شوێنێکدا پەیوەندی بە گۆڕانکاریە سیاسیو ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتیو ئابوریەکانی ژیانی ئەو گەلەوە هەبوە ، بەم پێیە ، ڕۆژنامەی کوردیش پەیوەندی بەو بارەوە هەبووە کە ئەو لایەنانەی ژیانی گەلی کوردی تێدا بووە . لەدوای شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ تینێکی باش بە جوڵانەوەی ڕۆژنامەگەری کوردی دراو هەلێکی کراوەی هاتە بەردەم ، بەڵام ئەو قۆناغەش ڕۆژنامەی هەرەباش کە مستلزەماتی ڕۆژنامەگەریان هەبووە بەرامبەر زۆری ژمارەیان ، کەم بوون ، من لەلای خۆمەوە ، ئەم لایەنە دەگێڕمەوە بۆ ئەوەی کە کادیری ڕۆژنامەنووس لەناودا نەبووەو ئێستاش هەر ئەمە یەکێکە لەو کۆسپانەی لەبەردەم پێشکەوتنی ڕۆژنامەی کوردیدایە، بە سەرنجدانەوەی مێژووی ڕۆژنامەگەری جیهان بۆمان دەگێڕنەوە ، کە لە ئەوروپادا ، ڕۆژنامە ، وەك ئاراستەکەرو ڕاگەیەنەری ڕۆژشنبیریو سیاسیو هونەری هاتەکایەوە ، کارگێرەکانی ئەدیبو نووسەرەکان بوون ، کە زیاتر لە نووسیندا بەهێز بوون ، نەك لە هونەری ڕۆژنامەگەریدا ، تا دوایی فراوان بوونی کارەکە ، وای کرد کادیری شارەزاو تەرخان کراو بۆ ئەم کارە ، ڕۆژنامەنووسی بگرنە ئەستۆ ، ئەمشتە بیر دەهێنمەوە بۆ ئەوەی دەست بۆ ئەوە بکێشم کە بزوتنەوەی ڕۆژنامەی کوردی ، تا ئەم ساڵانەی دوایش ، سەرەتای پەنجاکان لە ئەستۆی ئەدیبو شاعیرو نووسەرە ڕۆشنبیرەکان بووەو ڕۆژنامە نووسی تەواوەتیمان بە مانا تێکراییەکەی نەبووە ، یان زۆرکەم بوون ، هەرچۆنێك بێ ، ئەوەی جێگای شانازیو سەربەرزی ئێمەیە ، ئەگەر بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلەکەمان بۆی هەیە شانازی بەوەوە بکات ، ڕۆژنامەی کوردی ، سەرەڕای ئەو هەموو کەمو کورتیو گیرو گرفتو کۆسپانەی هاتۆتە ڕێگای دەوری پیرۆزی لە پێگەیانەی مرۆڤی کورددا ، بینیوە .

هاوکاری
هەنگاوێکی پێشکەوتوبۆ

لە ٩ی(١) تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٩دا کە بڕیاری باوەڕهێنیان بە مافە ڕۆشنبیری یەکانی گەلی کورد ، لە لایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشەوە دەرچوو ، یەکێك لە بڕگەکانی ئەو بڕیارە ، دەرکردنی



رۆژنامەیەکی هەفتانەی سیاسی گشتی بوو ، بەهەق هەر لەدوای دەرچوونی بڕیارەکە ، بەماوەیەکی کەم ، دەست کرا بە خۆ ئامادەکردن بۆ دەرکردنی رۆژنامەکە ، ئەوسا ئەم ئەرکە بە دەزگای گشتی چاپ‌و بڵاوکردنەوە سپێردرا ، لێپرسراوانی ئەو دەزگایە ، پەیوەندیان بە چەند لاوێکی کوردەوە کرد کە لەبەغدا لە دەزگاکانی راگەیاندنا کاریان دەکرد . کەبریتی بوون لە «٥» کەس(٢) ، ئەم لاوانە ، ئامادەیان پیشاندا بۆ بەجێ هێنانی ئەرکی بەڕێوەبردنی ئەم رۆژنامەیە ، لەناو چەند ناوێکدا **«هاوکاری»** ئەو ناوە بوو ، بۆ رۆژنامەکە هەڵبژێردرا ... کاردەستی پێ‌کردو لە ٩-١-١٩٧٠ یەکەم ژمارەی رۆژنامەکە بە «١٦» لاپەڕەی قەوارە بچوك دەرچوو ، ئەم رۆژنامەیە ، هەر لە یەکەم ژمارەیەوە مۆرکی ئەوەی پێوەیە ، کە هەنگاوێکە بۆ درووست بوونی رۆژنامەی کوردی پێشکەوتوی هاوچەرخ ، ئەویش بەپێی ئەو تەقەللایەی لەگەڵی دەدراو ئەو شێوازە هاوچەرخەی کە لەدەرهێنیانی رۆژنامەکەدا هەر لەیەکەم ژمارەوە بۆی خرایە کار ، سەرەڕای ئەوەی هەر لە سەرەتاوە ، کەسانی شارەزا ، یان نیمچە شارەزا لەکاری رۆژنامەگەریدا دەستیان دایە دەرکردنی . یەکەمجار ، رۆژنامەکە وەك وتمان بە «١٦» لاپەڕەی قەوارە بچوك‌و «١٠٠٠» دانەی لێ دەردەچوو ، دوایی ، بیر لەوە کرایەوە ، ئەو قەوارە بچوکە ، لەگەڵ ئەو تەقەللایەدا ناگونجێ کە بۆ دەرکردنی رۆژنامەیەکی نوێ دەدرێ ؛ چونکە لاپەڕەی زۆر مانای خۆبەستنەوەیە بە زۆرێکەوەکە لەوانەیە ئەنجام «بۆر» دەربچێ ، دوای ژمارە «١١» قەوارەکەی گەورەکرا ، وەك رۆژنامەی ئاسایی‌و بە ٨ لاپەڕە دەرچوو ، لە ناوەراستی ساڵی ١٩٧٢دا ژمارەی چاپکراوی رۆژنامەکە گەیشتە (٢) هەزار دانەو کە لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٤دا لە «دار الجماهیر»ەوەخرایە سەر «ددزگای هاوکاری چاپ‌و بڵاوکردنەوەی کوردی» ژمارەی چاپکراوی گەیەنرایە «٢٫٥٠٠» دانەو لە ساڵی ١٩٧٦دا کە هەردوو بەریوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری کوردی‌و دەزگای «هاوکاری چاپ‌و بڵاوکردنەوەی کوردی» لێك‌دراون [دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی]دروست کرا ، رۆژنامەی **«هاوکاری»** ژمارەی چاپکراوی گەیشتە «٤٠٠٠»و لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٧داو لەژمارەی ٣٨٦ وە لەچاپی «لیتەرپرێس»ەوە کرا بە «ئۆفسێت»و ژمارەی چاپکراوی گەیشتە «٥٠٠٠» دانە .

ئەمە پیاچونەوەیەکی خێرایی دروست بوونی رۆژنامەی **«هاوکاری»** یە .

تێستا ، باپرسین ، بۆچی «هاوکاری» هەنگاوێکی پێشکەوتوە بۆ دروست کردنی رۆژنامەی کوردی ؟ ، چونکە :

هەر لەیەکەم ژمارەیەوە ، ئەم رۆژنامەیە لە دەرهێنان‌و دابەش کردنی مادده نووسراوەکانیداو هەڵبژاردنی ئاونیشان‌و رازا ندنەوەی لاپەڕەکانیدا متمانەی بەئوسلوبی تازەی دەرکردنی رۆژنامەگەری کرد . بۆیەکەمجار لە رۆژنامەی کوردیدا لاپەڕەکانی رۆژنامەی **«هاوکاری»** بەپێی باسەکان‌و جۆری نووسراوەکانی دابەش‌کراو ، یەکەم رۆژنامەی کوردیە لەنەخشەی لاپەرەکانیا متمانەی بەشارەزایی تایبەتی لەم‌جورەهونەرەکردوە . سەرنج دانەوەی ئەو رۆژنامانەی بەر لە **«هاوکاری»** بەکوردی دەرچون‌و بەراورد کردنیان لەگەڵ **«هاوکاری»**دا ئەم راستیانە ساغ دەکەنەوە .

لەلایەکی ترەوە ، ئەم دەست‌پێ‌کردنەی رۆژنامەی **«هاوکاری»** دەرگای لەبەردەم چەندین لاوی رۆشنبیردا کردەوە ، کە دەست بدەنە ئەم پیشەیە ، پیشەی رۆژنامەنووسی ، کە دەستیشیان دایە پیشەکە ، لەیەکەم پلەی شارەزابوونەوە دەستیان پێ‌کرد ، هەتا دەتوانین بڵێین «رێپورتاجی رۆژنامەنووسی» بەکوردی لە **«هاوکاری»**یەوە دەست پێ‌دەکا ، هەروەك لەسەرەتاشدا وتمان ، ئەوانەی لە رۆژنامەی **«هاوکاری»دا** کاریان دەست پێ‌کرد ئەم بنەڕەتەیان داناو بەردەوام لەپێشکەوتنیشدا بوە ، چی رۆژنامەکە خۆی ، چی ئەو کادرانەی کاریان تیاکردو .

خۆ ئەگەر بێینە سەر لایەنی خزمەتی رۆشنبیری‌و خزمەتی جەماوەری گەلەکەمان ، ئەوا دەبێ بێ‌سێ‌و دوو کردن ئەوە بۆ **«هاوکاری»** دەست نیشان بکەین ، کە لە بڵاوکردنەوەی بیروڕای پێشکەوتخوازانەداو هوشیار کردنەوەی جەماوەرو نزیك کردنەوەی لەرۆشنبیری پێشکەوتخوازی سەر بە گەلدا دەورێکی پیرۆزو کاریگەری بینیوە و لەرووی ئەدەبەوە هەر لەیەکەم ژمارەوە ، دەرگای لەسەر پشت بوە بۆ

